www.alibapir.com

زنجیرەی بابەتە هەنوکەییەکان

ئەلقەی دەیەم




# قوتابیان

## لەم هەل و مەرجەدا پێویستە چۆن بن و چی بکەن؟!

عەلی باپیر



2008

www.alibapir.com



مافی لەچاپدانەوەی پارێزراوە
بۆ
نوسینگەی تەفسیر

ناوی کتێـــب: قوتابیان لەم هەل‌و مەرجەدا پێویستە چۆن بن‌و چی بکەن؟!
نـوســـەر: عەلی باپیر
بڵاوکردنەوەی: نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن هەولێر
خــــە ت: نەوزاد کــۆیی
نەخشەشازی ناوەوە: عزەددین محەممەد
بــــەرگ : ئەمیـن موخـلص
نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم 1429ك – 2008ز
تـــــیراژ: 2000 دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (     )ی ساڵی 2008 ی دراوەتێ

تەفسیر
بۆ بڵاوکردنەوە و راگەیاندن
هەولێر- شەقامی دادگا - ژێر ئوتێلی شیرین پالاس
ت : ٢٢٢١٦٩٥ - ٢٢٣٠٩٠٨- ٢٥١٨١٣٨
مۆبایل : ٠٧٥٠ ٤٦٠ ٥١ ٢٢ - ٠٧٧٠ ١٣٨ ٧٢ ٩١
tafseeroffice@yahoo.com
tafseeroffice@maktoob.com
altafseer@hotmail.com

www.al-tafseer.com

www.alibapir.com





﴿وَلاَ تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ إِنَّ السَّمْعَ وَالْبَصَرَ وَالْفُؤَادَ كُلُّ أُولئِكَ كَانَ عَنْهُ مَسْؤُولاً﴾ (الإسراء-36)

(طلب العلم فريضة على كل مسلم)

رواه ابن ماجه عن أنس رضي الله عنه

# پێشکەش بێ

بەو گەنج‌و قوتابییانەی کە دوای ئیمان‌و خواپەرستی‌و خۆڕازاندنەوە بەڕەوشت‌و ئاکاری بەرزو پەسند، خوێندن‌و فێربوونی زانست، بە گەورەترین ئەرك‌و کاریان دادەنێن.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


# پێشەکی‌و پێناسەی ئەم نامیلکەیە

الحمدلله والصلاة والسلام على رسول الله محمد والمهتدين بهداه

بێگومان توێژی گەنج -بەهەردوو ڕەگەزەکەیەوە- بەگشتی‌و قوتابیان بەتایبەتی، هەستیارترین‌و گرنگترین توێژی هەر کۆمەڵگایەکن‌و، چارەنووسی هەر گەل‌و کۆمەڵگایەك تا ڕاددەیەکی زۆر بە جۆرو چۆنیەتی گەنج‌و قوتابییەکانیەوە بەستراوەو بۆ زانینی ڕووگەو ڕێڕەو (إتجاه)ی هەر گەل‌و کۆمەڵگایەکیش پێویستە سەرنجی حاڵ‌و باڵ‌و واقیعی گەنج‌و قوتابییەکانی بدرێ‌و لەو ڕووەوە (قیبلە نوما) ئاسا ڕێڕەوی کۆمەڵگا دەستنیشان دەکەن .

ئەم نامیلکەیەش[1] بریتیە لە کۆی ئەو وتارو پرسیارو وەڵامانەی لە کۆڕێك کە لە ( هۆڵی هونەرە جوانەکان)ی شاری سلێمانی دا لە (2007/5/1) بۆ بەندە بەسترابوو ژمارەیەکی زۆریش لە گەنج‌و قوتابیانی کوڕو کچ تێیدا بە شدار بوون، ئەنجام دراون.

هیواداریشم ئەم بەرهەمە ببێتە مایەی بەهرەمەندبوون‌و بەر چاو

(1) کە سەرەتا کاك (مەلا یاسر) هێناویەتە سەر کاغەزو پاشان کاك (مەلا بیلال قەڵادزەیی) پێیدا چۆتەوەو دووبارە دایڕشتۆتەوەو پاشان خۆشم چاوم پێدا گێڕاوەتەوەو، دواییش کاك (حیدر مظفر) تایپی کردوە، خوا پاداشتی هەموو لایەکیان بداتەوە

www.alibapir.com



ڕوونبوونەوەی زۆرێك له گەنج‌و قوتابییەکانمان‌و پارێزرا یان لە هەردوو دەردی کوشندەی:

1- تەسلیم بوونی واقیعی نالەبارو هەل‌و مەرجی نا هەموارو تێدا توانەوەی.

2- نائومێد بوون‌و ڕاکردن‌و سەری خۆ هەڵگرتن بەرەو هەندەران.

سبحانك اللهم وبحمدك أشهد ألا إله إلا أنت أستغفرك وأتوب إليك

26/ جمادي الثانية 1428ك

11 تەموزی 2007 ز هەولێر

لە ڕێگەی کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
عەلی باپیر/AliBapir
archive.org/details/@alibapir
عەلی باپیر/AliBapir
AliBapir
Google Play
App Store
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## سەرەتای وتارەکە

برایان‌و خوشکانی بەڕێز!

سەرەتا بەخێرهاتنی هەموو لایەك دەکەم‌و خۆشحالّم بە دیدارتان.

خوشك‌و برایانی قوتابی بەڕێزو خۆشەویستم!

ناوو نیشانی کۆڕەکەمان بەم شێوەیە: قوتابییان لەم هەلو مەرجەدا پێویستە چۆن بن‌و چی بکەن؟!

بۆیەش ئەم سەرباسەم هەلّبژارد چونکە کەم‌و زۆر ئاگادارم کە چینی قوتابیمان بە تایبەت‌و چینی گەنج بە گشتی، دووچاری کۆمەلّێك قەیران‌و گرفت‌و کێشە بوونەتەوە لە هەرێمی کورد ستان‌و لەنێو ئەم ولاّ تەی خۆماندا، کە بێگومان قەیران‌و کێشەو گرفتی قوتابیان‌و گەنجانیش بە هەردوو ڕەگەزی کوڕان‌و کچانەوە، بەشێکە لە قەیران‌و کێشەو گرفتەکانی کۆمەلّگایەکەمان بە گشتی!

واتە ئێمە پێمان وانەبێ کە ئەوە هەر قوتابییانن گرفت‌و کێشەیان هەیە، یاخود هەر گەنجانن، بەلاّم هەرکەسە هەست بە ئازاری خۆی دەکات، وە بێگومانیش چینی قوتابیان‌و چینی گەنجان لە زۆر چین‌و توێژی دیکەی کۆمەلّگا هەستیارترو هەست ناسکترن‌و، زووترو زیاتر هەست بە گرفت‌و کێشەکان دەکەن، وە حازر بەدەستتریشن بۆ هەلّوێست نواندن لە بەرامبەریاندا، وە تەفاعولکردنی ئیجابی یاخود سەلبی لەگەلّیاندا.

ئەمەش هەندێك لەو کێشەو گرفتانە کە لێرەدا وەك سەردێڕێك ئاماژەیان پێدەکەم:

www.alibapir.com



ونکردنی ناسنامە، کە ئەمەیان کێشەیەکی فیکریی گشتییە لە نێو میللەتەکەماندا، هەروەها بێمتمانەیی کە لە هەموو ئاستەکاندا هەیە، کێشەیەکی دیکە نائومێدییو دڵساردییو بێهیوایی لە ئایندەی وڵاتو ئایندەی هەرێمو هەلومەرجی سیاسیو نەتەوەیی خۆمانە، وە کێشەیەکی دیکە بریتییە لە ناکۆکیو نا تەباییو گوریس پچڕکێنەی نا ڕەوا، هەڵبەتە جاری وا هەیە ناکۆکیو جیاوازی فیکرییو سیاسی دەبێ، بەڵام کە ناکۆکیو گوریس پچڕکێنە سەر بکێشێ بۆ لە بەینبردنی تواناو هێزو وزەکان، بێئەوەی وڵات بەرەو پێشەوە بەرێو، بێئەوەی ببێتە هۆی گەشە کردنمان، بێگومان ئەوە ناکۆکییەکی زیان بەخشو ناڕەوایە.

یەکی دی لەو کێشەو گرفتو دیاردە سەلبییانەی کە هەموومان دەیانبینین بریتییە لە قڕییو پڕییو چینایەتی! بە داخەوە دەڵێم ڕۆژ بە ڕۆژ ژمارەی دەوڵەمەندەکان کەمتر دەبێو سەروەتو سامانیان زیاتر دەبێ، وە ژمارەی خەڵکی هەژارو نەداریش زیاتر دەبێو دەرامەتیان کەمتر دەبێ! واتە: ئێمە خەریکین وەك وڵاتانی ڕۆژئاوا بە تایبەتی ئەمریکامان لێ دێت، لە ئەمریکا بە پێی هەندێك سەرژمێری ئەو وڵاتە ئێستا(5٪) خەڵك خاوەنی (95٪) داهاتی وڵاتەکەنو (95٪) خەڵکەکەش خاوەنی (5٪) دا هاتن، کە ئەوەش یەکێکە لە دەرهاوێشتەکانی سیستەمی سەرمایەداریی، چونکە ئەو سیستەمەی کە لەسەر بیرۆکەی سیکۆلاریزمو لیبرالیزم بنیات دەنرێت، سەر بۆ ئەوە دەکێشێ کە سەرەنجام کێ ئازاتر بێ لە پارەو سەروەتو سامان وەسەر یەکنان، بە بێ ڕەچاوکردنی کۆمەڵێك پرەنسیب (مبادیء) کە دەستی تاك دەگرن لە پێناو بەرژەوەندی گشتی دا وەك ئەوەی کە لە شەریعەتی ئیسلامیدا هەیە، خۆی دەوڵەمەندتر بکات

www.alibapir.com



لەسەر حیسابی خەڵکی.

ئێستا دەبینین لە جیهانی سەرمایەداریی دا بە شێوەیەکی ڕەهاو بەبێ گوێدانە بەرژەوەندی گشتی، کێ ئازاترە خۆی دەوڵەمەنتر بکات!، کە بێگومان ئێستا لە کوردستانی ئێمەشدا ئەو دیاردەیە زۆر بەزەقی دەبینرێ! تەماشا دەکەین جۆرەها بازرگانی کردن‌و کە سابەتی ئەوتۆ ڕەواجی پێ دەدرێ کە زیانی زۆر لە خەڵکی دەدەن، وە بەردەوام هەر سۆپەرمارکێت دەکرێنەوە کە پارەی زیاتر دەخەنە گیرفانی دەوڵەمەندو سەرمایەدارەکانەوەو پارەی زیاتر لە گیرفانی خەڵك بە گشتی دێتە دەرێ!

بەڵێ ئێستاکە ئەوەندەی بیر لە کردنەوەی سۆپەرماکێتەکان دەکرێتەوە بە چارەگی ئەوە بەڵکو (1/10) ئەوەش بیر لە درو ستکردنی کار گەو کارخانەی جۆراو جۆر ناکرێتەوە! کە بێگومان ئەوە بە شێکە لە درو ستکردنی ژێر خانی ئابووری بۆ کۆمەڵگاو وڵاتەکەمان، تاکو میللەتەکەمان لەسەر پێی خۆی بوەستێ‌و بۆ هەموو شتێك هەر ئاتاجی خەڵك‌و وڵاتانی دیکە نەبێ!!

ئێمە کە جاروبار باسی ئەوە دەکەین حەقی خۆمانە قەوارەو دەوڵەتی سەربەخۆمان هەبێ، کە بێگومان حەقی خۆشمانە نەك هەرێمێکی فیدراڵی بەڵکو دەوڵەتیشمان هەبێ‌و لە وڵاتی خۆماندا ئازادبین‌و سەربەست بین‌و، ماف خوراو و ماف پێشێلکراو نەبین، بەڵێ کاتێك ئەو دروشمانە بەرز دەکەینەوە  کە وەك گوتم بێگومان حەقی خۆشمانە  پێویستە بیریش لەوە بکەینەوە کە ئەوەش کۆمەڵێك پێداویستی دەوێن، تۆ کاتێك هەر لە دەستە سڕی کاغەزو ئاوی خواردنەوەوە بگرە هەتا سەرجەم کەل‌وپەلەکانی دیکە، نیازمەندو ئاتاجی غەیری خۆتی، ئەوە مانای وایە داوای کیان‌و

www.alibapir.com


دەوڵەتکردنت بەس دروشم و خەیاڵ پڵاوەو، بێگومان ئەو حاڵەتە حاڵەتێکی زۆر نەگونجاوە بۆ میللەتێك کە دەیەوێ لەسەر پێی خۆی بوەستێ و خاوەنی کیان و قەوارەی خۆی بێ، چونکە بێگومان خاوەنی کیان و قەوارەی خۆبوون کۆمەڵێك مەرج و بنەمای هەن و ئەگەر مەرج و بنەمایەکان نەهێنیـ ـنەدی، بانگەشەی خاوەنی کیان و قەوارەی خۆبوون، هەر دەبێتە درو ـشم و هیـ چی دی و، هەربایی ئەوە دەکات کە وەك شتێکی عاتیفی دڵی خۆ ـمانی ـپێ خۆش بکەین!!

یەکی دیکە لە قەیران و گرفتەکان کە چینی ـ گەنجانمان بەگـ ـشتی و ـبە تایبەت قوتابییان بە دەستیانەوە دەناڵێنن و پێیانەوە گرفتارن، بریتـ ـیە ـلە مەسەلەی بێ بەندو باریی و ڕەوشت نزمیی و ڕەواج پێدانی پشت ـلە ـخوا کردن و دوور کەوتنەوە لە ئیسلام و دوور کەوتنەوە لەو ئەخلاق و ڕەو ـشت و ئاداب و نەریتانەی کە دینەکەمان فەرمانمان پێدەکات، پێیانەوە پابەند بین.

جا وەك لە سەرەتاوە گوتم ئەو قەیران و کێشانەی کە ئا ـماژەم پێـ ـکردن تەنیا چەند سەردێڕێك و چەند ناو و نیشانێك بوون بۆ هەندێك لەو کێـ ـشەو قەیرانانەی کە بە دەستیانەوە گرفـ ـتارین، وەك لوێـ ـچێك ـلە ـتەغارێك، ئەگەرنا بێگومان قەیران و گرفت و کێشەی دیکەشمان زۆرن لە گەلێك بواری دیکەدا.

ئێستاش هەموومان لە بەردەم پرسیارێکدا خۆمان دەبینینەوە:

ئایا ئێمە چۆن دەتوانین لەگەڵ ئەو قەیران و کێشەو گرفتانەدا ڕوو ـبەڕوو ببینەوە؟!

بەتایـ ـبەتی مەبە ـستم ـپێ بە ـشداربووانی ـئەم کۆڕە ـیە، قوتابـ ـیە خۆشەویست و بەڕێزەکانمان کە ئێستا ـلە خز ـمەت بە ـشێکیان دام، ئا ـیا

www.alibapir.com


قوتابیانی شیرین‌و سەنگینی ئێمە لە کوردستاندا لەم هەڵو مەرجەدا کە قۆناغێکی سەخت‌و دژوارە، چۆن دەتوانن لە گەڵ ئەم قەیران‌و گرفت‌و کێشانەدا بژین‌و چۆن دەتوانن ئەم قۆناغە بەڕێ بکەن، وەتوو شی ئەو حاڵەتە نەبن کە بەشێك لە گەنجەکانمان‌و لە قوتابی یەکانمان تووشی بوون، کە بریتیە لە نائومێدیی‌و سەری خۆ هەڵگرتن‌و وڵات بەجێهێشتن وە ڕوو لە هەندەران کردن؟! کە وەك کوردەواری خۆمان دەڵێن: (دەنگی دە هۆڵ لە دوور خۆشە)، هەندێك وادەزانن کە چوونەدەر نەجات بوونە لە دۆزەخ‌و چوونە بەهەشتە، بەڵام لە ڕا ستیدا وانییە، چونکە خو شك‌و برا یانی خۆشەویست! هەم ئێمەش دەرەوەمان بینیوەو هەم خەڵکیش هەیە لە دەرێ گەڕاونەتەوەو حەتمەن ئێوەش کەم‌و زۆر دەبیستن کە بەڕاستی ئەو ژیانەی لەوێ خەڵك بەسەری دەبات، بەتایبەتی چینی گەنج‌و قوتابی‌و چینی تازە پێگەیشتوو، ژیانێکی زۆر سەخت‌و نارەحەتەو لە زۆر لاوە ف شاریان دەکەوێتە سەرو کەسێك بیەوێ پارێزگاریی لە دین‌و ئیمان‌و ئەخلاقی خۆی بکات، دەبێ زۆر خۆی ماندوو بکات‌و بە تەواویی ورییای خۆی بێ، هەڵبەتە وێڕای ئەوەش هەندێکیان هەر دەکەونە ژێر کاریگەریی خراپی ئەو کۆمەڵگایانەو ژمارەیەکی بەرچاویان خۆیان لە دەست دەدەن، نەك هەر خۆ لەدەست دانی فیکرو بیروباوەڕ، بەڵکو جاری وا هەیە خۆ لە دەست دانی نەفس‌و جەستەش، بۆ زانیاریتان لە شارەکانی ڕۆژئاوا - بەریتانیاو وڵاتانی دیکە  گەنجی کوردمان هەیە ئێستا لە شێتخانەکانن، وە هەیانە گیرۆدەی نەخۆشی دەروونی بوون‌و لە نەخۆشخانەی تایبەت بەو بوارە لە ژێر چارەسەردان، وە هەیانە لەو شوێنە تایبەتی یانەن کە چاودێری کۆمەڵایەتی دیاری کردوون بۆ تێدا بەخێوکردنی ئەو جۆرە کەسانە، وەهەندێکیان بە

www.alibapir.com



مادده‌ سڕكه‌رو سه‌رخۆشكه‌ره‌كانه‌وه‌ ڕاهاتون، كه‌ كه‌سایه‌تی‌و هه‌موو ڕه‌وشتێكی ئیسلامی‌و بگره‌ ئینسانیشیان له‌ ده‌ست داوه‌!!

جا ئایا له‌م قۆناغ‌و هه‌ل‌و مه‌رجه‌دا قوتابیانمان چۆن ده‌توانن ته‌حه‌ممول بكه‌ن‌و له‌ جیاتی ئه‌وه‌ی هه‌ڵوێستێكی سه‌لبیی بنوێنن، هه‌ڵوێستی ئیجابیی‌و پڕ له‌ سه‌روه‌ریی‌و جوامێریی پیشان بده‌ن؟!

وه‌ ئایا گه‌نج‌و لاوه‌كانمان به‌هه‌ردوو ڕه‌گه‌زه‌كه‌وه‌ به‌ گشتی‌و به‌تایبه‌ت قوتابیان، چۆن ده‌توانن فاكته‌رو هۆكارێك بن بۆ گۆڕینی ئه‌م وه‌زعه‌ به‌ره‌و چاكه‌؟! من له‌ وه‌ڵامی ئه‌م پرسیاره‌ له‌ شه‌ش خاڵدا تیشك ده‌خه‌مه‌ سه‌ر فاكته‌رو هۆكاره‌ گرنگ‌و سه‌ره‌كییه‌كانی خۆڕاگریی‌و ڕاوستاویی گه‌نج‌و قوتابییه‌كانمان له‌ به‌رده‌م قه‌یران‌و كێشه‌و گرفته‌كانی ئه‌م ڕۆژگارو هه‌ل‌ومه‌رجه‌مانداو نه‌به‌زین‌و وره‌ به‌رنه‌دان‌و بگره‌ ڕۆڵ گێڕانی ئیجابییش بۆ پاكسازیی‌و چاكسازیی تێدا ئه‌نجامدانی:

www.alibapir.com



## یه کەم: زانیـنی حیکـمەتی درو ستکرانی خۆ مانو ئا مانجی ژیانمان:

خوشكو برا خۆشەویستەكانم!

بە گشتی دوو جۆرە بوونناسییو تێڕوانین هەن:

یەك: بوونناسیو تێڕوانینێكی ئیمانییو ئیسلامیی كە تایبەتیش نیە بە پەیامو بەرنامەی پێغەمبەری كۆتایی (محمد)ەوە ﷺ، بەڵكو هەموو پێغەمبەران -عَلَيْهم الصَّلاة والسَّلام- ئەو جۆرە بوونناسییو دنیا بینی یەیان هەبووە، بوونناسیی ئیسلامییش بە كورتی و پوختی ئەوەیە كە ئینسان جێنشینی خوایە لەسەر زەویو ئینسان بۆیە دروست كراوە كە جێنشینی خوا بێو بە پێی ڕێنمایی خوا (عزّ وجلّ) لە جیاتی خوا سەر زەوی ئاوەدان بكاتەوە، وە ئامانجی ژیانیش ئەوەیە كە ئینسان تێیدا تاقی بكرێتەوەو لە قۆناغێكی دیكەی ژیانیش دا كە ژیانی هەمیشەییو نە بڕاوەی ڕۆژی دوایی یە، ئەنجامی تاقیكرانەوە كەی وەربگرێتەوەو لە بەهەشتی ڕازاوەو شیرین یان دۆزەخی بڵێسەدارو بە تین دا نیشتەجێ بێ!

دوو: وە دنیا بینییو تێڕوانینێكی دیكەمان هەیە كە دەگونجێ بڵێین تێڕوانینێكی ئیلحادیی، یان بێ بڕوایانە یان سیكۆلاریستانە...هتد، گرنگ ئەوەیە ئەو دنیا بینی‌یە تێڕوانینێك نیە كە لە وەحیو دینی خواوە سەرچاوەی گرتبێ!!

پوختەی ئەمیش ئەوەیە كە: مرۆڤ ئەگەر گریمان خواش دروستی

www.alibapir.com



کردبێ، حەواڵەی خۆی کردوەو لێی گەڕاوەو، نە بەرنامەو پەیامی بۆ ناردوە نە پێغەمبەرانیشی بۆ ڕەوانەکردوە!!

یاخود دەڵێ: ئینسان هەر بۆخۆی پەیدا بووەو خوا دروستی نەکردوەو ژیانیش هەلو مەرجێکە ڕەخساوەو ئینسان هاتۆتە نێوی!

جا دیارە ئێمە لێرەدا نامانەوێ باسی دنیابینیی سیکۆلاریستانە بکەین‌و لەو زنجیرە باسەدا کە لە هەفتەنامەی (هاوڵاتی)دا بڵاو دەکرێتەوە قسەمان لەبارەوە کردوە[1]، بۆیە یەکسەر دەچینە سەر باسی چۆنیەتی تێڕوانینی ئیسلام بۆ بوونەوەرو ژیان‌و مرۆڤ و دەڵێین: با لە ڕوانگەی ئیمان‌و ئیسلامەوە تەماشای ئینسان‌و ژیان بکەین، بزانین ئینسانمان چۆن دەکەوێتە بەر چاوو ژیانی مرۆڤ چۆن دەبینین؟! خوا سبحانە وتعالی دەفەرموێ: ﴿وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلآئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً﴾(البقرة-30)، واتە: کاتێك خوا بە فریشتەکانی فەرموو من جێنشینێك لە سەر زەوی دادەنێم.

جا براو خوشکە قوتابییە خۆشەویستەکان!

ئینسان ئەگەر بەم جۆرە تەماشای خۆی بکات‌و بڵێ: من جێنشینی خوام، واتە خوا منی لەسەر ئەم زەوییە داناوەو بۆیەش لێرەی داناوم تاکو بە فەرمانی ئەو و لە جیاتی ئەو سەر زەوی ئاوەدان بکەمەوە، چونکە خوای پەروەردگارو بەدیهێنەر بۆ خۆی کاروباری ئاسمانەکان بەڕێوە دەبات، بۆیە نارێکییەك نیە لە کاروباری خوا لە ئاسمانەکاندا، بەڵام لە سەر زەوی

(1) ئێستا ئەو زنجیرە باسە لە دوو توێی کتێبێك دا بە ناوی: (تەوژمی ئیسلامیی‌و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان) کۆکراونەوە.

www.alibapir.com


نارێکیو پەشێوی زۆر هەیە چونکە سەر زەوی عا یدی ئینسان کراوەو بەرێوەبردنی لە ئەستۆی وی دایە.

جا ئایا ئینسان ئەگەر وا تەماشای خۆی بکات کە جێنشینی خوا یەو خوا رێزی لێ گرتوە، وەك خودا فەرموو یەتی ﴿وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ﴾(الإسراء-70)، وە خوا لە چاکترین شێوەدا دروستیکردوە: ﴿لَقَدْ خَلَقْنَا الإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ﴾(التين-4)، ئا یا ئینسانێك ئاوا تەماشای خۆی بکات، زۆر جیاواز نیە لە ئینسانێك کە بەشێوەیەك تەماشای خۆی دەکات- وەك پێشتر باسمان کرد- کە پێی وایە بێ خاوەنەو هیچ کەس دروستی نەکردوە، یان دەڵێ: ئەگەر خواش دروستی کردبم حەقی بەسەر مندا نیەو وێڵی کردووم؟!!

بێگومان ئەو دوو ئینسانە شێوەی بیر کردنەوەیانو شێوەی ژیانو گوزەرانیان زۆر جیاواز دەبێ.

کاتێك تۆ ژیانی دنیا بە تاقیکردنەوە بزانیو بڵێی: من لەم سەر زەوییەو لەم ژیانەدا دانراوم تاکو تاقی بکرێمەوەو خوای پەروەردگار خاوەنمەو تاقیم دەکاتەوەو بەوە تاقیم دەکاتەوە کە بە شێوەیەك بژیم ئینسانەتییم تێدا پارێزراو بێو رێزو حورمەتو کە سایەتیی ئینسانانەم پارێزراو بێ، وە سەرەنجامیش خوا لێم رازی بێ، کە ئەویش بەوە دە بێو دێتەدی، پابەندبم بە شەریعەتو بەرنامەی خواوە لە ژیانی تاکییو خێزانیو کۆمەڵایەتیو سیاسیو...هتدم دا، وەك خوا سبحانە وتعالی دەفەرمویٚ: ﴿الَّذِي خَلَقَ الْمَوْتَ وَالْحَيَاةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا وَهُوَ الْعَزِيزُ الْغَفُورُ﴾ (الملك-2)، واتە: ئەو خوایەی کە مردنو ژیانی

www.alibapir.com



ڕەخساندوون تاکو تاقیتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی چاکترە، وە ئەو زاڵ‌و لێبوردەیە.

هەروەها لە سوورەتی (هود)دا دە فەرموێ: هەموو بوونەوەر ( هەر حەوت ئاسمانەکان‌و زەوی) بۆیە دروست کراوە تاکو ئینسان تاقی بکرێتەوە!- وە شایانی باسە ئەم ئایەتە تاکە ئایەتێکە بەم شێوەیە هاتوە لە هەموو قورئاندا- کە دەفەرموێ: ﴿**وَ هُوَ الَّذِي خَلَقَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ وَكَانَ عَرْشُهُ عَلَى الْمَاءِ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلاً**...(7)﴾ واتە: خوا ئەو کەسەیە کە ئاسمانەکان‌و زەوی دروستکردوون لە شەش ڕۆژاندا[1] وە ئەو کاتە بارەگای خوا لەسەر ئاو بوو تاکو تاقیتان بکاتەوە کە کامەتان کردەوەی چاکترە...کەواتە: بوونەوەر هەر هەمووی شانۆیەکە هەڵخراوەو بازاڕێکە سازکراوە بۆ تێدا تاقیکرانەوەی ئینسان، جا لێرەدا جێی سەر سوڕمان ئەوەیە کە کەسانێکی نامسوڵمان‌و نائیسلامی، ئیسلام بەوە تۆمەتبار دەکەن کە ڕێز لە ئینسان ناگرێ‌و مافەکانی ئینسان‌و ئازادییەکانی دابین ناکات! لە حاڵێکدا کە خوای بەدیهێنەر دەفەرموێ: ئینسانم کردوە بە جێنشینی خۆم، وە دەفەرموێ: ئینسانم لە چاکترین شێوەدا دروستکردوە، وە دەفەرموێ: ڕێزم لە ئادەمیزاد گرتوە، وە

(1) واتە بە شەش قۆناغ چونکە (یوم) لە زمانی عەرەبی دا واتە ماوەیەك لە کات(مدة زمنية) ئیدی (24) سەعاتە، وەك شەوو ڕۆژی سەر زەوی، یان(30) ساڵە وەك شەوو ڕۆژی هەندێك لە خڕۆکەو ئەستێرەکان، یان (1000) ساڵە وەك خوا دەفەرموێ: ﴿**وَإِنَّ يَوْماً عِندَ رَبِّكَ كَأَلْفِ سَنَةٍ مِّمَّا تَعُدُّونَ**﴾(الحج-47)، یان (50) هەزار ساڵە، وەك دە فەرموێ: ﴿**تَعْرُجُ الْمَلائِكَةُ وَالرُّوحُ إِلَيْهِ فِي يَوْمٍ كَانَ مِقْدَارُهُ خَمْسِينَ أَلْفَ سَنَةٍ**﴾(المعارج-4)، گرنگ ئەوەیە کە بە شەش قۆناغ خوا ئاسمانەکان‌و زەوی دروست کردوون

www.alibapir.com


دەفەرمویٚ: هەموو بوونەوەرم بۆ ئینسان دروستکردوە: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الأَرْضِ جَمِيعًا مِّنْهُ...﴾(الجاثية-13)، واتە: ئەو خوا یەی کە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەوی دایە بۆ ئێوەی دەستەمۆ و مەی سەر کردوە.

واتە: هەموو بوونەوەر بۆ ئینسان دروست بووە، جا ئەگەر ئەوە ڕێز لێگیران نەبیٚ بۆ ئینسان و کەرامەت و پایەو ڕێزدانان نەبیٚ، دەبیٚ ڕێز لێگرتنی مرۆڤ چۆن بیٚ؟!

بەڵیٚ قوتابی و گەنجە بەڕێزو خۆشەویستەکان!

هەنگاوی یەکەمان بەرەو ژیانێکی مرۆڤانەی ڕاست و دروست و بەختەوەر، ئەوەیە کە ئێمە حیکمەتی دروستکرانی خۆمان بزانین کە ئایا بۆچی دروستکراوین؟ وە ئامانجی ژیانمان بزانین و حاڵی ببین کە دەبیٚ بۆ چی بژین؟! نەك وەك یەکێك لە نەفامەکان دەڵیٚ: (أرحام تدفع وقبور تبلع) هەر منداڵدان دەرداوێن و قەبرەکانیش قووت دەدەن! بێگومان ژیان هەر ئەوەندە نیە کە لە نێوانی هاتنە دەر لە منداڵدان و چوونە نێو قەبردا کورت ببێتەوە، ئایا ئینسان زۆر لەوە گەورەترو بەرزو بەنرختر نیە کە ژیانە کەی هەر ئەوەندە بیٚ شەست حەفتا ساڵێك بژی و بیٚ و بچیٚ و دوایی بڕوات و بیٚ سەروشوێن بیٚ و ببیٚ بە بەردی بن گۆمیٚ و (خبرکان) و کەس نەڵیٚ: لە کوێوە هاتووی و بۆ کویٚ دەچی و، بۆ خۆشی لە خۆی حاڵی نەبیٚ بۆ چی دروست کراو ژیا؟!!

بەڕاستی تێڕوانینی ماددییانەو ئیلحادییانە بۆ ئینسان و ژیان گەورەترین بیٚڕێزی تێدایە بۆ ئینسان، چونکە ئەگەر ژیانی مرۆڤ لەو تەمەنە کورتەی ژیانی سەر زەویدا کورت هەڵبیٚ، مانای وایە مرۆڤ

www.alibapir.com


تەمەنەکەی هێندە کەم‌و کورتە کە تەنانەت ناگاتە رێژەیەك کە بۆ هەندێك لە دروستکراوەکانیش دانراوە، بۆ نموونە:

درەخت هەیە (1000) ساڵ تەمەنیەتی، هەروەها فیل‌و کیسەڵ‌و هەندێك جۆرە ئاژەڵ‌و ژیاندار لە ئینسان زیاتر تەمەن دەکەن! بۆیە ماقووڵ نیە ئینسان- کە خوا دەفەرموێ: جێنشینی منە لە سەر زەوی بە ئەندازەی هەندێك لە دارو درەخت‌و ژیاندارو ئاژەڵ تەمەن نەکات!

کەواتە نابێ ئینسان هەر ئەوەندە تەمەنەو هەر ئەم ژیانەی هەبێ‌و بەس ئەوەندەی پێ رەوا بینرابێ، بۆیەش خوای پەنهانبین دەفەرموێ: ﴿أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثًا وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لا تُرْجَعُونَ ۞ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ﴾(المؤمنون- 115-116)، واتە: ئایا پێتان وایە بە گاڵتە خولقاندوومانن‌و ئێوە ناشگەڕێنەوە بۆلای ئێمە؟! بەرزیی بۆ خوای پادشای حەق، واتە: بەرزیی‌و پاکیی بۆخوا کە ئێوە بە گاڵتە بخولقێنێ.

ئنجا دوای ئەوەی ئێمە حیکمەتی خولقێنران‌و دروستکرانی خۆمانمان زانی، کە بۆیە دروستکراوین جێنشینی خوابین لەسەر زەوی‌و بەندایەتیی بۆ بکەین، وە ئامانجی ژیانی دنیاشمان زانی کە بریتیە لە تاقیکردنەوەمان، پاش ئەم تێڕوانین‌و قەناعەتە، بێگومان هەوڵدەدەین کە لەو تاقیکردنەوەیە دەرچین، چونکە ئەگەر دەرچین بەس خۆمان قازانج دەکەین‌و ئەگەر بشکەوین خۆمان زیانبار دەبین‌و نە لە حاڵەتی دەرچوونماندا خوا ( سبحانه وتعالى) قازانجێکی پێدەگات، وەنە لە حاڵەتی کەوتنماندا خوا تبارك وتعالى زیانێکی پێدەگات! چونکە خوای بەرزو توانا پێش ئەوەی ئێمە دروست بکات هەر خوا بووە، دوای ئەوەش کە ئێمە هەمووومان لە نێو

www.alibapir.com



دەچینو سەر زەوی وەك پەرێزێكی لـێدێ كە دانەوێڵەی لێ دروابێتەوە وەك خوا فەرموویەتی: ﴿فَجَعَلْنَاهَا حَصِيدًا كَأَن لَّمْ تَغْنَ بِالأَمْسِ﴾(یونس-24)، خوا (عزّ وجلّ) هەر وەك خۆیەتیونە بە لادانمان ز یان دە كاتو نە بە پەرستنو فەرمانبەریی مان ئێمە زیاد دەكات، بەڵكو بەس خۆمانین قازانج دەكەین یان زەرەر دەكەین، وەك دەفەرموێ: ﴿مَنْ عَمِلَ صَالِحًا فَلِنَفْ سِهِ وَمَنْ أَسَاء فَعَلَيْهَا وَمَا رَبُّكَ بِظَلامٍ لِّلْعَبِيدِ﴾(فصلت-46)، واتە: هەر كەسێك چاكە بكات قازانجەكەی بۆ خۆ یەتیو هەر كە سێكیش خرا پە ب كات زیانەكەی بۆ خۆیەتی وە خوا ستەمكار نیە بەرانبەر بە بەندەكانی.

جا دیارە مرۆڤ تەنیا بە بەندایەتی(عبودیة)بۆ خوا لە تاقیكرد نەوەی ژیانی دنیا دەردەچێو ئەو ئامانجو حیكمەتە دێنێتەدی كە خوا بۆی وەدی هێ ناوە، وەك فەرموو یەتی:﴿وَ مَا خَلَ قْتُ الْ جِنَّ وَالإِ نسَ إِلاَّ لِيَعْبُدُونِ﴾(الذاريات-56)، واتە: وە جندو مرۆڤم بەس بۆ ئەوە درو ست كردوون كە بمپەرستن و بەندایەتیم بۆ بكەن.

ئنجا ئاشكراشە كە بناغەو كاكڵەی بەندایەتی بۆ خوا كردنو خوا پەرستییش (ئیمان)ە، هەر بۆیەش ئێمە (ئیمان) مان كردۆ تە دووە مین هۆكاری زاڵبوون بەسەر كۆسپو تەگەرەكانی ژ یانو گوزەرانو كێ شەو قەیرانەكاندا.

لە ڕێگەی كۆمەڵایەتییەكان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاكەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
AliBapir
كەناڵی ڕاكەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر
www.alibapir.net
English - عربي - كوردی
ڕاكەیاندنی مەكتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## دووەم: ئیمـــان هێنـــان:

هەرکات ئینسان زانی حیکمەتی بوونی چی‌یەو بووناسییەکی ڕاست دروستی هەبوو و تێڕوانینێکی ڕێك‌و ڕاستی هەبوو و زانی بۆچی دروست بووەو ئامانجی ژیانی چیە، ئەوە یەکسەر ئەو بووناسییو تێڕوانینەی وای لێدەکات کە ئیمان بهێنێ‌و هەڵوێستێکی ئیجابیی لە بەرانبەر خوادا وەربگرێ کە بریتیە لە ئیمان پێهێنانی.

ئیمان یـــانی چـــی؟

ئیمان واتە: وەك چۆن بەس خوا پەروەردگارو بەدیهێنەرو خاوەن‌و مشوورخۆرو بەڕێوەبەرە، تۆش هەر ئەو بکەی بە پەرستراوو پەروەردگارو بەڕێوەبەرو خاوەن‌و فەرمانڕەوای خۆت‌و بڵێی:

خوایە مادام تۆ بەدیهێنەرو خاوەن‌و ژێنەرو مرێنەرو ڕۆزیدەرو زیندووکەرەوەی منی، تۆ چۆنت پێخۆشە من وا دەژیم‌و ئەوەی تۆ پێتخۆشە دیارە ئەوە بۆ من چاکەو ئەوەی پێتناخۆشە دیارە ئەوە بۆ من خراپە!!، تەماشا دەکەین منداڵێك ئەگەر لاسار نەبێ، کاتێك باب‌و دایکی پێی دەڵێن: ڕۆڵە گیان وابکەی باشەو وانەکەی باشە، یەکسەر بە قسەیان دەکات، چونکە دەزانێ باب‌و دایکی بۆی دڵسۆزن، دەجا بێگومان خوای بەخشندە زۆر لە باب‌و دایك بۆ ئێمە دڵ سۆزترە، وەك لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتوە کە (بخاري)و (مسلم) گێڕاویانەتەوە کە لە یەکێك لە جەنگەکاندا پێغەمبەر ﷺ ئافرەتێکی بینی بە دوای منداڵێکدا دە گەڕا، منداڵێکی شیرە خۆری دۆزی یەوە بە سینگی خۆیەوە گوشی‌و مەمکی

www.alibapir.com



دایەو لە باوەشی گرت، پێغەمبەر ﷺ بە هاوەڵە بەرێزەکانی فەرموو: پێتان وایە ئەم ئافرەتە ئامادەیە ئەو کۆرپەو جگەر گۆشەیەی خۆی بخاتە نێو ئاگر؟ گوتیان: نەخێر سوێند بە خوا، ئەویش فەرمووی: دەجا بێگومان خوا بەرانبەر بە بەندەکانی بە ڕەحمترە لەو ئافرەتە بەرانبەر بە کۆرپەکەی[1].

بەڵێ خوا لە هەمووکەس پتر عەبدەکانی خۆش دەوێ‌و زیاتر بە تەنگیانەوەیەو بەزەیی پێیاندا دێتەوە، هەر بۆیەش خوا (سبحانه وتعالی) بە درێژایی مێژووی ئینسان، پێغەمبەرانی ناردوون وەك لە (مسند)ی ئیمام (احمد)دا هاتووەکە خوای کاربەجێ (124000) پێغەمبەری ڕەوانە کردوون کە خوا (سبحانەو تعالی) دەربارەیان دەفەرموێ: ﴿وَرُسُلاً قَدْ قَصَصْنَاهُمْ عَلَيْكَ مِن قَبْلُ وَرُسُلاً لَّمْ نَقْصُصْهُمْ عَلَيْكَ﴾(النساء-164)، واتە: پێغەمبەرانێك (عَلَيْهِم الصَّلاة والسَّلام) کە هەیانە بەسەرهاتەکەیانمان بۆت گێڕاوەتەوەو هەشیانە بەسەرهاتەکەیانمان بۆت نەگێڕاوەتەوە، شایانی باسیشە تەنیا ناوی (25) یان لە قورئاندا هاتووەو ئەوانی دیکە ناویان نەهاتوە.

براو خوشکە قوتابی‌یە خۆشەویستەکان!

بەڕاستی کاتێك ئینسان ئیمان دێنێ، دەکەوێتە سەر جادەو ڕاستە شەقامێك لە خۆی حاڵی دەبێ‌و دەزانێ چیەو پێناسەو ناسنامەی خۆی دەدۆزێتەوەو دەزانێ لە کوێوە بۆ کوێ دەچێ‌و دەزانێ بۆچی دروستکراوەو

(1) عن عمر بن الخطاب رضي الله عنه قال: قدم رسول الله ﷺ بسبـي فإذا امرأة من السَّبْـي تسعى، إذ وجدت صبياً في السبـي أخذته فألزقته ببطنها فأرضعته، فقال رسول الله ﷺ: أترون هذه المرأة طارحة ولدها في النار؟! قلنا: لا والله، فقال: (الله أرحم بعباده من هذه بولدها) متفق عليه.

www.alibapir.com



کێ خاوەنیەتیو دەزانێ حەلالو حەرام چیەو چاكو خراپ لێك جیا دەکاتەوەو...هتد.

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُواْ وَعَمِلُواْ الصَّالِحَاتِ يَهْدِيهِمْ رَبُّهُمْ بِإِيمَانِهِمْ﴾(یونس-9)، واتە: بێگومان ئەوانەی ئیمانیان هێناوەو کردەوەی باش ئەنجام دەدەن، خوا بەهۆی ئیمانەکەیانەوە ڕێنموونییان دەکات.

بەڵێ برا خۆشەویستەکانم!

خوشکە بەڕێزەکانم!

ئیمان وەك چراو لایتێك وایە لە شەوێکی تاریکدا بەرپێت ڕووناك دەکاتەوە، ئیمان تێتدەگەیەنێ کە تۆ بۆ دروست بووی؟ لە کوێوە هاتوویو بۆ کوێ دەچی؟ دەبێ چی بکەیو چۆن بکەیو ئەرکت چیە لەم ژیانەدا؟

بەلام بێگومان ئینسانی بێئیمان لە تاریکییو شەوەزەنگ دایە، بۆیە خوای بەرزو مەزن لەبارەی بابای کافرەوە دەفەرموێ: ﴿ظُلُمَاتٌ بَعْضُهَا فَوْقَ بَعْضٍ﴾(النور-40)، واتە: ئینسانی کافر وەك ئەوە وایە کە لە نێو کۆمەڵە تاریکیەکی لە سەر یەك کەڵەکە بوو دابێ، چونکە ئینسانی بێبڕوا نازانێ لە کوێوە هاتوەو بۆ کوێ دەچێو بۆچی هاتوەو نازانێ کێ دروستی کردوەو بە هەر لایەکدا دەڕوانێ هەمووی هەر تاریکییە، تەماشای ڕابردووی دەکات تاریکایی دەبینێ، تەماشای داهاتووی دەکات بە هەمان شێوەو سەرنجی ئێستاشی دەدات دیسان تەنیا هەر تاریکایی بەدی دەکات!!

بەلام ئیمان ڕوناکییو ڕۆشنایی یەو، کەسایەتیت دیاری دەکاتو لێت حالّی دەکات، کە تۆ شتێکی گچکە نی، بەڵکو دروستکراوێکی بەرزو

www.alibapir.com


گەورەو ناوازەی‌و بۆ ئامانجێکی گەورە دروست کراوی، وەك شاعیرێك دەڵێ:

**لقد خلقت لأمرٍ عظيم لو فطنت له**
**فاربأ بنفسك أن ترعى مع الهَمْلِ**

واتە: تۆ بۆ ئامانجێکی زۆر گەورە دروستکراوی ئەگەر هەستی پێبکەی، جا ئەی ئینسان بە خۆتی ڕەوا مەبینە کە لەگەڵ ئاژەڵاندا بلەوەڕێی، واتە وەك چۆن ئاژەڵ دەخوات‌و دەلەوەڕێ‌و دەخەوێ‌و هیچی دیکە، تۆ وامەبە چونکە تۆ بۆ ئامانجێکی زۆر گەورە دروستکراوی‌و حیکمەتێکی مەزن لە پشت بوونتەوەیە.

لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com


## سـێیەم: کەسـایەتییەکی ئیسلامیی ساغ‌و ڕاست:

وەك چۆن هۆکاری دووەم لە هی یەکەم پەیدا دەبێ، هی سێیەمیش لە دووەم پەیدا دەبێ، ئەویش ئەوەیە کە دەبێ ئێمە کەسایەتییەکی ئیسلامیی‌و ئیمانییمان هەبێ، ئنجا ئایا کەسایەتیی ئیسلامیی‌و ئیمانیی بەچی بنیات دەنرێ؟

بێگومان دوای ئەوەی بوونناسی‌و تێڕوانینێکی ڕاست‌و دروستمان بۆ ئینسان بۆ ژیان‌و بوونەوەر هەبوو و دوای ئەوەی ئیمان دێنین، یەکسەر کەسایەتیی ئیسلامیی‌و ئیمانییمان بنیات دەنرێ، وەئێستا ئێوەی قوتابی لە هەموو کاتێك زیاتر پێویستیتان بەوە هەیە کە لەم قۆناغەی تەمەنتاندا کەسایەتی خۆتان دابڕێژن، وەك یەکێك لە پیاو چاکان دەڵێ:

(من لم تكن له بداية محرقة      لا تكون له نهاية مشرقة)

واتە: کەسێك سەرەتایەکی سووتێنەری نەبێ، ئایندەیەکی ڕۆشن‌و گەشەداری نابێ!

بەڵێ لە لاوێتیداو لە تەمەنی ئێستای ئێوەدا، ئینسان دەتوانێ کەسایەتیی خۆی دابڕێژێ، شایانی باسیشە کە سایەتییەکی ئیسلامیی‌و ئیمانیی بە چەند شتێك بنیات دەنرێ‌و دادەڕێژرێ، کە ئەم چوارە گرنگترینیانن:

www.alibapir.com



## 1- زانیاری (العلم):

تەماشا بکەن پێغەمبەری خوا ﷺ نەخوێندەوار بوو، وە لەنێو میللەتێکی نەخوێندەواردا ڕەوانە کرا، بەلاّم خوای کار بەجێ یەکەمین وشە کە بۆی دەنێرێ بریتیە لە(إقرأ) بخوێنە!

ئنجا قوتابیە خۆشەویستەکان!

با ئێمە وانەزانین کە ئێستا جیهانی ئیسلامی لە چاو ڕۆژئاوا لە ڕووی تەکنەلۆجیاو زۆر شتی دیکەوە دواکەوتوویەو پاشکۆی ڕۆژئاواین‌و ئاتاجی ئەوانین، لە حالّەتێکی ئاسایی داین، بەلّکو لە ڕاستیدا ئەم حالّە تەمان حالّەتێکی نا ئاسایی‌یەو ئەو کاتەمان حالّەتێکی ئاسایی‌و سروشتی بوو کە مسولّمانان لە هەموو ڕوویەکەوە سەرقافلّەی مرۆڤایەتی بوون، ئەو کاتەی کە ئەورووپا لە تاریکایی سەدەکانی نێوەڕاستدا بوو، مسولّمانان لەڕێی زانکۆکان‌و مزگەوتەکان‌و قوتابخانەکانیانەوە عیلم‌و نوورو مەعریفەتیان بەسەر دنیادا پەخش دەکرد، چاکەکاریی‌و داد گەریی یان فێری خەلّك دەکردو مامۆستای مرۆڤایەتی بوون لە هەموو ڕوویەکەوە.

بەلّێ ئەو حالّەتە حالّەتێکی ئاسایی‌و سروشتی ئێمەی مسولّمان بوو، نەك ئەوەی ئێستای ئێمە، (أبو حامد الغزالي) ڕەحمەتی خوای لێ بێ نزیکەی هەزار سالّ بەر لە ئێستا لە کتێبی (إحياء علوم الدين)دا گوتوویەتی (ئەگەر مسولّمانان پەکیان لەسەر هەر کەل‌و پەلێك بکەوێ‌و نەتوانن خۆیان دروستی بکەن، هەموویان گوناهبارن)، چونکە پێویستە لەسەر مسولّمانان کە هەرچی پێداویستی ژیان‌و گوزەرانیانە خۆیان دابینی

www.alibapir.com


بکەن، جا ئایا دەبێ ئێستا مسولمانان چەندە گوناهباربن کە بۆ هەموو شتێك پێویستی‌یان بە غەیری خۆیانە ؟!

بەڵێ کەسایەتیی ئیسلامیی‌و ئیمانیی ئێمەی مسولمان پێش هەموو شتێك بە عیلم دادەمەزرێ‌و دادەڕێژرێ، دیارە سەرەتاو بەر لە هەر شتێك شارەزاییی‌و زانیاری بەو ئایین‌و بەرنامەیەی کە خوا بۆی ناردووین، ئن جا زانیاری‌و زانست بە هەر شتێکی دیکە کە لە خزمەتی بەشەر دایە،وە لە ئیسلامدا زانیاری نەکراوە بە زانیاری شەرعیی‌و غەیرە شەرعیی، چونکە هەموو زانیارییەك شەرعیی یە، بەڵکو زانیاری کراوە بە دوو بەش: زانیاری نەقڵیی‌و عەقڵیی، ئەو زانیاریی یەی کە لە وەحیی‌و پەیامی خواوە د یێت، ئەوە زانیاری نەقڵیی یە، زانیاری عەقڵییش ئەوەیە کە لە ڕێی عەقڵ‌و پێنج هەستەکان‌و ئەزموونەوە وەردەگیرێ، ئە گەرنا زان یاری عەقڵییش هەر زانیاری شەرعیی یە، وە لە ئیسلامدا هەموو جۆرە زانیارییەك هەر چاك‌و پەسندە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەو زانیاری یە لە چیدا بەکاردەهێنرێ؟ جا هەر جۆرە زانست‌و زانیاری یەك بێ: جوگرافیا، کیمیا، پزیشکی ( طب)، گەردووناسی...هتد، هەر زانیاری یەك مادام لە خزمەتی مرۆڤایەتیدا بێ ئەوە شتێکی شەرعیی یەو شتێکی ویستراوو داوا کراوە، د یارە ئا یەت‌و فەرموودەش لە مەدح‌و ستایشی زانیاری‌و زانایا ندا بە موت ڵەقی، زۆر زۆرن، بۆ نموونە:

﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لا يَعْلَمُونَ ؟!..﴾(الز مر-9)، واتە: بڵێ: ئایا ئەوانەی دەزانن‌و ئەوانەی نازانن یەکسانن؟!

(طلب العلم فريضة على كل مسلم) رواه ابن ماجه عن أ نس ر ضي الله عنە، واتە: داواکردنی زانیاری‌و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی لەسەر هەموو

www.alibapir.com


مسوڵمانێك پێویستە.

## 2- بەندایەتی بۆ خواکردن (العبادة لله):

دوای زانیاری (العلم) کەسایەتیی ئینسانی مسوڵمان بە عیبادەت‌و بەندایەتی بۆ خوا دادەڕێژرێ، عیبادەت چ بە مەبەستە تەسك‌و شەخسییەکەی، وەك نوێژو ڕۆژوو، زیکرو دووعاو پاڕانەوەو زەکات‌و حەج...هتد، چ بە واتا فراوانەکەی کە بریتیە لە بەندایەتی بۆ خوا بە واتای فراوانی بەندایەتی لە هەموو بوارەکانی ژیان‌و گوزەراندا، خوای بەرزو مەزن لەو بارەوە دەفەرموێ: ﴿**يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا ارْكَعُوا وَاسْجُدُوا وَاعْبُدُوا رَبَّكُمْ وَافْعَلُوا الْخَيْرَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ**﴾(الحج-77)، واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ڕکووع بەرن‌و کڕنووش بەرن‌و پەروەردگارتان بپەرستن‌و چاکە بکەن بەڵکو سەرفراز بن.

## 3- پارێزکــاریی (التقوى):

دوای عیبادەت، بە پارێزکاریی کەسایەتیی ئیسلامیی‌و ئیمانیی مان بنیات دەنرێ، چونکە تەقوا بەرهەمی عیبادەتە، ئاخر عیبادەت بۆ خوا، واتە: بۆ خوا ملکەچ بوون‌و خوا لە هەموو شتێك زیاتر خۆشویستن‌و خوا لە هەموو کەس لەلا گەورەو بەڕێزتربوون، ئنجا تەقواش، بریتیە لە مامەڵە کردن لەگەڵ خوادا لەسەر بناغەی پارێزکردن‌و لە خۆ وریابوون، بە جۆرێك کە سنوورەکانی شەرع نەبەزێنی‌و نە فەرزەکان بچوێنی‌و نە قەدەغەکان بشکێنی، هەندێك کەس تەنیا واتایەکی سەلبیی لە تەقوا دەگرێ‌و دەڵێ:

www.alibapir.com



تەقوا واتە غەیبەت نەکەی‌و درۆ نەکەی‌و ڕوانینی حەڕام ئەنجام نەدەی‌و حەڕام نەخۆی‌و خراپە نەکەی!، بەڵام لە ڕاستیدا تەقوا واتا کەی وانییە، بەڵکو تەقوا پێش ئەوەی (خراپە نەکردن) بێ (چاکە کردن)ە، واتە: پێش ئەوەی واتاو چەمکێکی سەلبیی هەبێ، واتاو چەمکێکی ئیجابیی هەیە، بەڵێ تەقوا ئەوەیەکە زانیاری وەدەست بێنی‌و کاری خێرو چاکە بکەی‌و بەندایەتی بۆ خوا ئەنجام بدەی‌و پەیوەندی خزمایەتی (صلة الرحم) جێبەجێ بکەی‌و خزمەت بە خەڵك‌و وڵات بکەی‌و وڵات ئاوەدان بکەیەوەو بەرەو پێشی بەری‌و ...هتد، ئنجا واتە: خراپە نەکەی‌و زیانت بۆ خەڵك نەبێ‌و درۆ نەکەی‌و گیرۆدەی سیفەتە خراپەکانی وەك: درۆو ناپاکیی‌و خووو خدەی دزێو و ناشیرین نەبی.

کەواتە: تەقوا بەرهەمی عیبادەت‌و بەندایەتی کردنە بۆ خوا، کە لە پابەندیی بە شەریعەتەکەیدا بەرجەستە دەبێ، خوای بێ‌هاوتاش لەوبارەوە دەفەرموێ: ﴿يَا أَيُّهَا النَّاسُ اعْبُدُواْ رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ وَالَّذِينَ مِن قَبْلِكُمْ لَعَلَّكُمْ تَتَّقُونَ﴾(البقرة-21)، واتە: ئەی خەڵکینە! ئەو پەروەردگارەتان بپەرستن، کە ئێوەو ئەوانەی پێش ئێوەشی دروستکردوە، بەڵکو پارێز بکەن.

وەك دەبینین خوا (عزّ وجلّ) پارێزکاریی (تەقوی)ی کردۆتە بەر هەمو ئەنجامی خوا پەرستیی.

## 4- ڕەوشتی چاك (الخلق الحسن):

بێگومان ڕەوشتی بەرزو جوان‌و پەسندیش یەکێکی، دیکەیە لەو تایبەتمەندییانەی، کە کەسایەتیی ئیسلامیی‌و ئیمانیی مرۆڤی مسوڵمان

www.alibapir.com



دادەرێژێ، وە لە ڕاستیدا هەرکاتێك ئینسان پەیوەندی لەگەڵ خوادا باش بوو، لەگەڵ خەڵکیشدا مامەڵەو هەڵس‌و کەوتی باش‌و جوان دەبێ، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: ﴿ فَاتَّقُواْ اللّهَ وَأَصْلِحُواْ ذَاتَ بِيْنِكُمْ.. ﴾(الأنفال-1)[1]، واتە: پارێز لە خوا بکەن‌و پەیوەندی نێوانتان چاك بکەن، بەڵێ هەر کەسێك لەگەڵ خوادا ڕاست بێ لەگەڵ خەڵکدا چاك دەبێ، هیچ گومانتان لەوەدا نەبێ هەر کەسێك لەگەڵ خوا بێ‌و بەندەی چاکی خوا بێ‌و لەگەڵی ڕاست‌و ساغ بێ، هەرگیز ناتوانێ زیان بە خەڵك بگەیەنێ، بەڵکو هەوڵ دەدات خۆشبەختیی‌و بەختەوەریی‌و بەرژەوەندیی‌و خێرو قازانجیان بۆ دابین بکات، ئەوەش بە فەرمانبەریی‌و بەندایەتی بۆ خوا دەزانێ، ئێستا من کە لە خزمەت ئێوەدا دانیشتووم بە عیبادەتی دەزانم‌و وەك چۆن شەو هەڵدەستم دوو ڕکات شەو نوێژ دەکەم، یان ڕۆژووی سوننەت دەگرم، ئومێدم بە پاداشتی خوایە، بە خوا بۆ ئەمەش بە هەمان شێوە ئومێدم پێیەتی‌و هەمان چاوەڕوانییم لێی هەیە!

لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

(1) شایانی باسیشە کە لە هەرکام لە کتێبی (ڕێگای صالح بوون‌و بەرەو خوا چوون)‌و نامیلکەی: (خو و ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسوڵمانەتییە)دا، تا ڕاددەیەکی باش لە چەند ڕوویێکەوە لەبارەی (خوو ڕەوشتی چاك) (حسن الخلق)ەوە دواوین.

www.alibapir.com



## چوارەم: خوێندن‌و بە دوای زانیاری دا گەڕان(طلب العلم):

ئەمەیان تایبەت‌و پەیوەستە بە ئێوەوە وەك قوتابیانی خۆشەویست، سەرەتا پێویستە هەموولایەکمان بزانین کە خوێندن‌و فێرخوازیی  کە لە زاراوەی شەرعدا پێی دەگوترێ (طلب العلم) بەدوای زانیاریدا گەڕان- نەك هەر شتێکی پەسندو دروست(جائز)ە، بەڵکو پێویست‌و ئەرکی سەر شانە وەك پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێ: (طلب العلم فريضة على كل مسلم[1]) رواه ابن ماجة عن أنس -رضي الله عنه-، واتە: داواکردنی زانیاری‌و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی لەسەر هەموو موسوڵمانێك فەرزە، کەواتە بەدوای زانیاری دا گەڕان لەسەر هەموو موسوڵمانێك فەرزە، دیارە

(1) لە هەندێك ڕیوایەتدا هاتوە: (طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة) واتە: وەدەستهێنانی زانیاری لەسەر هەموو پیاوێکی موسوڵمان‌و ئافرەتێکی موسوڵمان فەرزە، بەڵام بۆ زانیاریتان ئەوە پێویست ناکات، چونکە ڕیوایەتی بەهێزتر ئەوەیە کە هێناومانەو هەر دەفەرموێ: (على كل مسلم)، دیارە وشەی (مسلم)یان (مؤمن)یش کە لە قورئان یان لە سوننەتدا دێن، هەردوو ڕەگەزی نێرو مێ دەگرنەوەو کاتێك خوا دەفەرموێ: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا) ئەوە هەردوو ڕەگەزەکە دەگرێتەوە، وەك لە (سوننەت)دا هاتوە: ڕۆژێك (أم سلمة)ی دایکی ئیمانداران خێزانی پێغەمبەرﷺ گوێی لە پێغەمبەری خوا بوو کە فەرمووی (يَا أَيُّهَا النَّاسُ) ئەویش یەکسەر خۆی پێچایەوەو یەکێك لێی پرسی ئەوە بۆ کوێ دەچی؟ گوتی: دە چم بۆ مزگەوت چونکە پێغەمبەرﷺ بانگ دەکات، ئەو کەسەش گوتی: خۆ دەڵێ ئەی خەڵکینە! (يَا أَيُّهَا النَّاسُ) ئەویش گوتی: جا منیش یەکێکم لە خەڵك (ناس)و هەر بانگی پیاوان ناکات‌و لەگەڵ هەموویانیەتی، کەواتە ئەم وشانەی قورئان: (يَا بَنِي آدَمَ ، يَا أَيُّهَا النَّاسُ، يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا، يَا أَيُّهَا الإِنسَانُ) مەبەستی پێ هەردوو ڕەگەزی نێرو مێیە بێ جیاوازی.

www.alibapir.com



تا ئەو ئەندازەیەش لەسەری فەرزە کە بتوانێ ئەو ئەرکانەی لە سەری پێویستن ئەنجامیان بدات‌و بابی ئەوەندە ئەو ئەرکانەی لەسەری فەرزن بە شێوەیەکی ڕاست‌و دروست ئەنجامیان بدات، دەبێ زانیاری پەیدا بکات، چونکە نابێ مسوڵمان هیچ هەنگاوێك بنێ بەبێ عیلم، کە نوێژ دەکات دەبێ بزانێ چۆنی دەکات‌و زانیاری پێی هەبێ، وە هەروەها نابێ کەسابەت بکات بەبێ هەبوونی شارەزاییو زانیاری بە جۆری کەسابەتەکەی، وە نابێ سیاسەت‌و حوکمڕانیی بکات بەبێ هەبوونی شارەزاییو زانیاری پێویست بەو بوارە، بەکورتی: نابێ هیچ هەنگاوێك بنێ هەتاکو زانیاری دەربارەی ئەو هەنگاوەی خۆی نەبێ‌و بەر پێی خۆی نەبینێ، بەڵگەشمان ئەوەیە کە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿**وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ**﴾(الإسراء-36)، واتە: (بەدوای شتێك مەکەوە کە زانیاریت پێی نیەو بەبێ زانیاریو بەرچاو ڕوونی هەنگاو مەنێ)، کەواتە مسوڵمان بۆ ئەنجامدانی ئەو ئەرکانەی لەسەری فەرزن کە جێبەجێ‌کردنی فەرزەکان‌و خۆدوورگرتن لە قەدەغەکانە، پێویستە زانیاری پەیدا بکات، وە بۆ جێبەجێ‌کردنی ئەو ئەرکانەی کە پەسندو سوننەتن، سوننەتە زانیاری پەیدا بکات، وە بۆ ئەو شتانەش کە موباح‌و ڕەوایە بیانکات، ڕەوایە کە زانیاری‌یان دەربارە پەیدا بکات‌و بەبێ شارەزاییو بەرچاو ڕوونیی نابێ هیچ هەنگاوێك بنێ‌و هیچ کارێك بکات.

ئنجا ئایا زانیاری بۆچی‌یە؟

خوشك‌و برا قوتابی‌یە خۆشەویستەکانم!

زانیاری وەسیلەیەو ئامانج نیەو بۆیە لەسەرت پێوستە بزانی، وە بۆیە

www.alibapir.com



پێویستە شارەزاو بەرچاو ڕوون بی، هەتا بە پێی ئەو شارەزایی یە هەنگاو بنێی‌و لە خراپە دوور بی‌و کردەوەی چاك‌و پەسند ئەنجام بدەی، کەواتە: با پێمان وانەبێ کە زانیاری خۆی لە خۆیدا ئاما نجە! ئەوەش بۆ یە دە ڵێم چونکە منیش قوتابی بووم، زۆر جار قوتابی ئەوەی بیری لـێدەکاتەوە هەر ئەوەیە کە دەربچێ‌و بڕوا نامەکەی وەربگرێ‌و ئەو قۆناغ‌و پلە یە ببڕێ! ئیدی بیر لەوە ناکاتەوە بڵێ: ئاخر باشە ئەوە زانیارییم وەرگرت، بەڵام ئەم زانیاری یەم بۆچی یە؟! ئەگەر زانیارییەکە هەر بۆ بڕوا نا مەو پار چە کاغەزێك بێ بیخەیە گیرفانتەوە، بێگومان ئەوە هیچ نیە!

بەڵێ لە ڕاستی دا زانیاری بۆ ئەوەیە کردەوەی پێ بکەی، سەرەتا لە خودی خۆماندا پاشان لە دەورو بەرو کۆمەڵگاکەماندا، زانیاری بۆ کردارە! زانین بۆ توانینەو، حاڵی بوون ئەوەیە لە خۆتدا بیکەیە حاڵ!

جا لێرەدا دەمەوێ ئاماژە بەهەندێك شت بکەم دەربارەی هەل‌و مەرجی ئێستای خوێندن‌و کەش‌و هەوای ئەم قۆناغەی کورد ستان کە بەدا خەوە قوتابییانی ئێمە بە کوڕان‌و کچانەوە بە گشتی‌و لە زانکۆ کان‌و پەیمانگاو ئامادەیی یەکاندا، هەل‌و مەرج‌و کەش‌و هەوایەکی خراپ ڕەخسێنراوە کە پێچەوانەی بە دواکەوتنی زانیاری‌و پەیداکردنی زانیاریی یە، چۆن؟ لە گەڵ ڕێزم بۆ خوشکانی سەنگین‌و بەڕێز، ئێستا زۆر لە زانکۆو پەیمانگاکان کراون بە پێشانگای خۆ ڕانواندن (عرض)ی ئافرەتان‌و پێم وانیە لە هیچ شوێنێکی دونیا بەو شێوەیە بێت، هەتا لە زۆر لە وڵا تانی ڕۆژ ئاوادا هەوڵی زۆر دراوەو لە هەوڵدان بۆ ئەوەی یان ئافرەتان بە جیا بخوێنن، یاخود بەرگ‌و پۆشاکێکی وایان لەبەر دابێ کە مێینایەتی یان زۆر تێدا بەرجەستە نەبێ‌و ئارەزووی پیاوان نەجوولێنێ، کەچی لێرە دەبینین بە دا خەوە قوتابخا نەو

www.alibapir.com



پەيمانگاو زانكۆكان بوونەتە پێشانگا (معرض)ی خستنە ڕووی لەشو لارو قەدو قيافەو، بەرگو پۆشاكی جۆراو جۆری غەريزە ورووژێنەرو سەرنج ڕاكێش، هەروەها وەنەبێ هەر ئافرەتان گيرۆدە بووبن، بەڵكو كوڕانيش تەماشا دەكەی هەريەكە مۆبايلێكی پێيەو تەنانەت لە كاتی وانەكانيشدا مۆبايل لە دەست وەردەداتو يان بە شێوەيەك هەڵسو كەوت دەكات كە پێچەوانەی ڕێزو ئەدەبی قوتابی يە بەرامبەر بە مامۆستاو، نەشياوە لەگەڵ حاڵەتێكدا كە لەسەر كورسی يەك دانيشتوە بۆ ئەوەی زانياری لەو مامۆستايە وەربگرێ!

بەڕاستی ئەوەش  بەداخەوە دەڵێم- هەمووی بەرهەمی ئەو ڕێڕەوە خوارو خێچو سەقەتەيە كە تەوژمی لادينيیو تەوژمی سيكۆلاريستو ليبراليست لە كوردستاندا گرتوويەتەبەر، كە بريتيە لەوەی باوەڕت بە ڕابردووی خۆت نەبێ، ياخود لە بەرچاو كەوتنی ڕابردووی خۆت، واتە بەچاوی بێزلێبوونەوەوە تەماشای دينو كلتوورو فەرهەنگو ئەدەبی خۆكردن، وە عاشق بوون بە خەڵكی ديكەو لاسايیكردنەوەی كوێرانەی خەڵكی ديكە لە فيكرو فەرهەنگو عەقيدەياناو لە هەڵسوكەوتو بەرگو پۆشاكو ...هتديياندا، كە بەڕاستی ئەوە بە هەموو پێودانگێك هيچ پەيوەندی بە زانياریو پێشكەوتنەوە نيە، وەك من لە زۆر شوێنو بۆنەدا گوتوومە يابانيەكان ئێستاش (بووذا) دەپەرستن، چينی يەكان ئێستاش كۆنفشيۆسو چەندان جۆرە بتو صەنەم دەپەرستنو هيندیيەكان چیو چی دەپەرستن، كەچی ئەو سێ وڵاتە  يابان، چين، هيند- لە ڕووی بازرگانیو پيشەسازیيەوە زۆر پێشكەوتوون، باشە ئەوەتا ئەوان دەستيان لە بت پەرستیو گا پەرستیو مشكو مار پەرستی خۆيان هەڵنەگرتوە، كەچی ئەو

www.alibapir.com


بیرو عەقیدە پووچانەیان ڕێگایان لێ نەگرتوون کە لە ڕووی بازرگانیو پیشەسازیو تەکنەلۆژیاوە بەرەو پێشەوە بچن، باشە ئەگەر بت پەرستیو دارو بەرد پەرستیو مشكو مارو مانگا پەرستی، ڕێگەی بەرەو پێشچوون لەوان نەگرێ- بەتایبەت یابانی یەکان کە لە تەکنەلۆژیای مەدەنییدا پێش ئەمریکاش کەوتوونەوە- بۆ دەبێ ئیسلامو ئیمان ئەو عەقیدە ڕاستو دروستە، ڕێگە لە ئێمە بگرێ کە بەرەو پێش بچین، وە بۆچی دەبێ ئەو هەڵسوکەوتو ڕەوشتە بەرزانەی ئیسلام ڕێگەی وەدەستهێنانی زانیارییمان لێ بگرن؟!

پاشان سەرنج دەدەین لەگەڵ ڕێژەدا بۆ هەموو لایەك- لەنێو قوتابییاندا کێ زیاتر ئاستی زانیاری بەرەو پێشەوە دەچێ؟

لەنێو کوڕاندا ئەوانەی خاوەن ئیمانو عەقیدەو کەسایەتییەکی ئیمانییەنو گرنگی تەواو بە خوێندن دەدەنو لە جیاتی ئەوەی سەرگەرمی مەسەلەی وورووژاندنی ئارەزووەکانیان بن، سەرگەرمی خوێندنو خوێندنەوەو لێکۆڵینەوەن، هەروەها لە نێو کچانیشدا ئەوانەی دیندارو خواپەرستنو پۆشتەو پەرداخنو خاوەنی شەرمو ڕێزن، ئەوانە زیاتر لێبڕاوی خوێندنو بەدەستهێنانی زانستو زانیارییەن! بەڵام ئەوانەی هەردەم سەرقاڵی دەست بەخۆدا هێنانو لەنجەو لارو چاو برکێو چاوچاوێنن، دیارە هەر فریای ئەوە دەکەونو نایان پەرژێتە سەر فێربوونی زانستو زانیاری!

پاشان دەڵێین: بەڕاستی شتێکی سەیرو بێ جێو نازانستییە کە داڕووتاندنی ئافرەت لەگەڵ بەرەو پێشچوونو زانستو زانیاری دا پەیوەست بکرێو پۆشتەو پەرداخییو حەیاو حەشمەتیش لەگەڵ دوا کەوتنو بەجێماویی دا؟!

www.alibapir.com


مەگەر زانیاریو زانست لە عەقلو دڵ دایە یان لە بەرگو پۆشاك دا؟!

کاتی خۆی مسوڵمانان مامۆستاو چاوساغو سەر قافڵەی مرۆڤایەتی بوونو حەیاو حەشمەتو پۆشتەییش هیچ ڕێی لە زۆرێك لە ئافرەتان نەگرت کە هەموو قورئان لەبەر بکەنو بگرە هەندێکیان توێژەرەوەی قورئان (مفسر القرآن)بنو فەرموودەناس (محدِّث) بنو لە تێکڕای زانستە جۆراو جۆرەکاندا شارەزاو پسپۆڕبن، وەك چۆن دینداریيو ڕەوشت بەرزیی ڕێی لە پیاوان نەگرت کە شارەزاو زانا بنو مامۆستای مرۆڤایەتی بن، ئنجا ئێمە دەبینین خەڵکێك هەیە هیچ شتێکی پێوە نەماوە نەئیمانو عەقڵیدە، نە هەڵسوکەوتو ڕەوشتی بەرزو پەسندی ئیسلامیی، نە هیچ، بەڵام تەماشا دەکەین زۆر دواکەوتوو و بەجێماوەو، هیچی بەسەر هیچەوە نییە، باسی دیموکراسی دەکات بەڵام دیکتاتۆرەو، باسی مافی مرۆڤ دەکات بەڵام غەیری خۆی وەك ئاژەڵ تەماشا دەکات! ئاشکراشە ئینسان تەنیا بە دروشم نابێ بە هیچ!

جا لە ڕاستیدا ئەو کەشو هەوایەی کە ئێستا لە زانکۆکانماندا ڕەخسێنراوەو کاری بەردەوامی لەسەر دەکرێ بۆ هێشتنەوەو پەرەپێدانی لە لایەن تەوژمی عەلمانیی دەسەڵاتدارەوە، پێچەوانەی زانیاریو زانستەو پێچەوانەی گەشەکردنو پێشکەوتنە، مەبەستم ئەو بێ بەندو بارییو سەر گەرمکردنەی توێژی گەنجو خوشكو برا قوتابیيەکانمانە بە لاسایی کردنەوەی کوێرانەی خووو خدەو خەسڵەتە ڕزیوو تەپیوەکانی خەڵکی ڕۆژئاواو سووڕانەوەیانە لە خولگەی ئارەزووەکانی خۆیاندا، کە بێگومان بە هیچ جۆرێك لە خزمەتی پرۆژەی خوێندندا نییەو بە پێچەوانەوە-وەك شوێنەواریشی بە زەقی دەبینرێ- مایەی بە جێماویی (تخلّف)و داڕووخان و

www.alibapir.com


فەوتانیشە!

## پێنجەم: هەڵسوکەوت لەگەڵ مامۆستایاندا:

دیارەمن کەم‌و زۆر شتم پێدەگاتەوە کە هەندێك لە مامۆستایان هەن بە پاشخان (خلفية)ی حیزبیی‌و سیاسی‌یەوە مامەڵە لەگەڵ قوتابیاندا دەکەن! کە بێگومان ئەوە شتێکی زۆر خراپەو وڵات هەرگیز بەو عەقڵییەتە بەرەو پێش ناچێ‌و بەڕاستی ئەو جۆرە هەڵسوکەوتانە سەردەمی ڕژێمی بەعسمان دێننەوە یاد!، بەڵێ دەبێ مامۆستا بە بێ‌لایەنیی (حیاد)ەوە لە گەڵ قوتابییەکانیدا ڕەفتار بکات‌و وەك باپێکی دڵسۆز بۆ ڕۆڵەکانی، ئاوا لەگەڵ قوتابییەکانیدا مامەڵەو ڕەفتار بکات‌و هەوڵ بدات زانست‌و زانیارییان فێر بکات‌و تێیان بگەیەنێ‌و پێیان بگەیەنێ، وە کامیان چالاکترو گورج‌و گۆڵتربێ ئەویانی خۆشتر بوێ‌و زیاتر ڕووی خۆی بداتێ، تاکو ئەوانی دیکەش هانبدرێن‌و چاوی لێبکەن‌و لەسەر خوێندن‌و چاکتر بن، نەك کامەیان کورو کچی بەرپرسێکی حیزبیی‌و حکومیی یە یاخود ئینتیمای سیاسی لەگەڵ ئەودا تێك دەکاتەوە، پشتی بگرێ‌و ئەگەر دەریش نە چوو هەر پاڵی پێوە بنێ، کەچی ئەوی دیکە هەرچەندە زۆریش زیرەك بێ، گرفتی بۆ دروست بکات‌و کۆسپ‌و تەگەرەی بۆ دروست بکات، هەر لەبەرئەوەی دووجار ڕەخنە لە مامۆستا دەگرێ، یان دوو شتی تێدایە کە پێچەوانەی سیاسەت‌و فیکری مامۆستایە، من دەزانم بەداخەوە ئەو شتانە لە خوێندنگاکانی کوردستاندا هەموویان هەن!

www.alibapir.com


شایانی باسە گەلێك جار خوشك‌و برای قوتابی پرسم پێدەكەن‌و دەڵێن: ئێمەی قوتابی دەبێ لەگەڵ مامۆستایانماندا چۆن بین؟

گوتوومەو ئێستاش دەیڵێم پێوستە لەگەڵ مامۆستایانتاندا بە شێوەیەك بن كە ئەدەبی فێركارو فێرخواز دەیخوازێ، وەك چۆن ئەدەبی مامۆستاو قوتابی دەیخوازێ، چونكە ئەو مامۆستایە بابی رووحیی‌و مەعنەوییە ئێوەیەو پاش باب‌و دایك لە هەموو كەس زیاتر مافی رێزو حورمەت لێگیرانی لەسەرتان هەیە، لە سۆنگەی ئەوەوە كە زانیاری (علم)و زانست (معرفە)تان فێر دەكات‌و لەو گەنجینەیە پێتان دەبەخشێ!

جا ئەگەر مامۆستایانی خراپ‌و حیزبگەراو موخەننەت‌و نادادگەرو بەفەرق‌و جیا هەن، بێلایەن‌و خاوەن ویژدان‌و باشیش زۆرن‌و، هەر چۆنێك بێ دەبێ قوتابی رێزی مامۆستای بگرێ، لەوبارەشەوە پەندێكی عەرەبی جوان هەیە كە دەڵێ: (الحرُّ من راعى وِدادَ لحظة ولَم يَنسَ مَن تعلَّم منه لفظة)، واتە: ئینسانی ئازاد كە سێكە هەركەسێك تۆزێك خۆشەویستی‌و دۆستایەتی لەگەڵدا هەبووبێ، وەفای بۆی هەبێ‌و بەرامبەر ئەو فەترە خۆشەویستی‌و دۆستایەتییە بێوەفاو سپڵە نەبێ، وە هەركەسێك وشەیەكی لێ فێربووبێ لە یادی نەكات!

پێویستە قوتابییەكانمان رێز لە مامۆستایەكانیان بگرن، ئەگەر مامۆستاش هەڵەو كەم‌و كوڕیی یەكی هەبێ، چونكە مامۆستا هەڵەو كەم‌و كوڕیی هەبێ‌و قوتابیش هەر وا بكات، دیارە دەبێتە گوریس پچڕكێنەو لە ئەنجامدا قوتابییەكە زەرەر دەكات، مامۆستاش لێی لە دڵ دەگرێ، بەتایبەت ئەگەر مامۆستاكە هێزێكی حیزبیی‌و سیاسی لە پشت بێ، دواتر دەبینین قوتابییەكە هەرچەندە زیرەكیشە كەچی یان دەرنا چوینرێ، یان

www.alibapir.com


تەنگی پێ هەڵدەچنرێ‌و ناهێڵرێ لە خوێندنی باڵا وەربگیرێ!

کەواتە هەر چۆنێك بێ ململانێی نێوان قوتابی‌و مامۆستا بە زیانی قوتابی دەشکێتەوە، لەبەر ئەوە من ئامۆژگاری خۆشك‌و برا قوتابیە خۆشەویستەکانم، دەکەم کە چۆن ئەدەبی قوتابی‌و مامۆستا دەخوازێ ئاوا مامەڵە لەگەڵ مامۆستایاندا بکەن‌و، ئەو دیاردە سەلبییانەش کە لە هەندێك مامۆستایاندا هەن، ئاشکرایە کە زیاتر شتی حیزبیی‌و سیاسین‌و ئومێد دەکەین لەسەر ئاستی سەرکردایەتی سیاسی بەشێوەیەکی جیدی چارەسەر بکرێ.

ئنجا با کۆتایی ئەم خاڵەش بەم فەرمایشتەی پێغەمبەری خوا ﷺ بێنین کە لە مەدحی زانایان‌و چاکەو خێر فێری خەڵك کەراندا فەرموویەتی: (ان الله وملائكته وأهل السماوات والأرض حتى النملة في جحرها وحتى الحوت ليصلون على معلِّمي الناس الخير)، رواه الترمذي: وقال حديث حسن. واتە: بێگومان خواو فریشتەکانی‌و خەڵکی ئاسمانەکان‌و زەوی‌و تەنانەت مێرووله لە قووڵە مێرووەکەیداو تەنانەت ماسییش، سەڵەوات بۆ چاکە فێری خەڵك کەران دەنێرن (واتە: خوا چاکەیان لەگەڵ دەکات‌و غەیری خواش لە فریشتەو...هتد بۆیان لە خوا دەپاڕێنەوە کە خێرو چاکەیان بێنێتە ڕێ).

www.alibapir.com


## شەشەم: هەڵس وکەوت لەگەڵ هاوەڵاندا:

ئنجا دەبێ قوتابی لەگەڵ هاوەڵەکانیدا چۆن بێ؟!

بێگومان لە ئیسلامدا هاوەڵایەتی‌و برایەتی‌و دۆستایەتی زۆر بەرێزەوە تەماشا کراوە، بۆ نموونە: لە سوورەتی (النور)دا خوای کاربەجێ مەجالی داوە کە ئینسان وێرای ماڵی خۆی لە ماڵی دە(10) جۆرە کەس نان بخوات، بێ‌ئەوەی مۆڵەتیان لێ وەربگرێ: ماڵی باب، ماڵی دایك، ماڵی برا، ماڵی مام، ماڵی پوور (خوشکی باب)، ماڵی خاڵ، ماڵی پلك (خوشکی دایك)، ماڵی کەسێك کە کلیلەکەی بەدەستە، وە ماڵی برادەرو هاوەڵ، وەك دەفەرموێ: ﴿لَيْسَ عَلَى الأَعْمَى حَرَجٌ وَلا عَلَى الأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلا عَلَى الْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلا عَلَى أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا مِن بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ آبَائِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أُمَّهَاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ إِخْوَانِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخَوَاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَعْمَامِكُمْ أَوْ بُيُوتِ عَمَّاتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ أَخْوَالِكُمْ أَوْ بُيُوتِ خَالَاتِكُمْ أَوْ مَا مَلَكْتُم مَّفَاتِحَهُ أَوْ صَدِيقِكُمْ ....(61)﴾ ، کەواتە: لە ئیسلامدا کەسێك برادەرو هاوەڵتە بۆت هەیە بەبێ پرس بچی لە ماڵیان نان بخۆی‌و دابنیشی، مادام تێی ڕابیینی‌و تێت ڕابیینێ، دیارە ئەوەش ڕێز دانانێکی زۆرە بۆ ڕەفاقەت‌و هاوەڵایەتی‌و پێویستە مرۆڤ لە برادەرایەتیدا هەتا دەتوانێ دڵسۆزبێ‌و لەگەڵ هاوەڵانیدا بە ڕەحم‌و بە وەفا بێ‌و ئەمیندارو پاك‌و ساغ بێ‌و هاوکارو دەستبارگربێ‌و، نابێ ئینسان لە

www.alibapir.com



هاوەڵایەتی‌و برادەرایەتیدا خۆ ویست‌و ئەنانیی بێ، بەڵكو دەبێ چاكەكارو خاوەن (إیثار) بێ‌و شتی چاك‌و پڕ لە قازانجی وەك بۆ خۆی پێخۆشە بۆ دۆست‌و هاوەڵ‌و ڕەفیقانیشی پێخۆش بێ.

هەروەها مەسەلەیەكی دی ئەوەیە وەك زۆرجار پرسیار دەكرێ: كە ئایا ئێمە وەك چینی گەنج‌و لاو بە تایبەت قوتابیان بە كوڕو كچەوە چۆن‌و چی بكەین لەو بۆنەو موناسەبانەدا كە دێنە پێش؟

لە وەڵامدا دەڵێین: سەرەتا ئینسانی مسوڵمان دەبێ هەوڵبدات خۆی نەخاتە مەوقیعێكەوە كە بزانێ، تێیدا تووش گوناح‌و تاوان دەبێ، وە ئەگەر تێكەوت بێ‌ئەوەی بەخۆی بزانێ دەبێ هەوڵبدات زوو خۆی لێ دەرباز بكات، مەبەستمان لێرەدا بۆنەیەكە كە شتی ناشەرعیی تێدایە، بۆ وێنە: شەڕابی تێدا دەخورێتەوە، یان قوماری تێدا دەكرێ، یاخود ئافرەت‌و پیاو پێكەوە هەڵدەپەڕن‌و سەما دەكەن، یان ئافرەتان بەرگ‌و پۆشاكی ناشایستەیان لەبەردایەو خۆیان ڕادەنوێنن، لەو حاڵەتانەدا گەنجێكی مسوڵمان بیەوێ خوا لەخۆی ڕازی بكات، بێگومان لە خۆی ناوەشێنێتەوە لەو جۆرە بۆنەو كۆڕانەدا دابنیشێ، وەك گوتم دەبێ هەر لە سەرەتاوە بەشداریی نەكات، خۆ ئەگەر تێشكەوت زوو خۆی لێ دەرباز دەكات!

لە كۆتاییدا ئامۆژگاریم بۆ هەموو لایەك بە گشتی‌و بەتایبەت براو خوشكانی گەنج‌و قوتابی ئەوەیە كە نە وشك‌و داخراوبن، نە زۆر كراوەو تواوەش بن! مەبەستم ئەوەیە ئینسانی مسوڵمان دەبێ هەمیشە ئیجابیی بێ، جا گەنج بێ پیر بێ، خوێندەوار بێ یان نەخوێندەوار، پیاو بێ یان ئافرەت، مسوڵمان نابێ بابایەكی سەلبیی بێ، بەڵكو دەبێ هەمیشە ئیجابیی بێ، پێغەمبەری خوا ﷺ لەوبارەوە دەفەرموێ: (المؤمن الذي

www.alibapir.com


يخالط الناس ويصبر على أذاهم أفضل من المؤمن الذي لايخالطهم ولايصبر على أذاهم) رواه الترمذي، واتە: ئەو ئیماندارەی تێکەڵ بە خەڵك دە بێو لەسەر ئازارەکانیشیان ئارام دەگرێ، باشترە لەو بڕوادارەی لەگەڵیان تێکەڵ نابێو ئارامیش ناگرێ لەسەر ئازارەکانیان، کەواتە: پێویستە ئیجابیی بین لە پەیوەندیماندا و نابێ وشكو داخراو بین، بەڵام نابێ هێندەش کراوە بین کە هیچمان تێدا نەمێنێو هەموو شتێك لەدەست بدەین، وەك خوای کاربەجێ لە باسی بەخشیندا دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَجْعَلْ يَدَكَ مَغْلُولَةً إِلَى عُنُقِكَ وَلَا تَبْسُطْهَا كُلَّ الْبَسْطِ فَتَقْعُدَ مَلُومًا مَّحْسُورًا﴾(الإسراء-29)، وا تە: دە ست مەنووقێنە بە گەردنتیەوە بنووسێنی (چونکە ئینسان ئەگەر شتێکی لێ داوا بکرێو بیەوێ نەیبەخشێ دەستی دەنووقێنێو بەیەکیەوە دەنوو سێنێ تا لە دەستی نەیەتە دەر، واتە: بەو شێوەیە مە بە کە هیچ چت لێ هەڵنەوەرێ)، بەڵام دیسان ئەوەندەش دەست کراوەو دەست بڵاویش مە بە کە هیچی پێوە بەند نەبێ، واتە: بەشی خەڵکیش بدەو بۆ خۆشت شتێکت بۆ بمێنێتەوە.

جا ئەوە لە هەموو شتێکدا هەر وایەو مسوڵمان پێویستە هەوڵبدات کە خەتی نێوەڕاست بگرێو هاوسەنگو میانەگیر بێو، نە تێ پەڕێنێ نە کورتی بێنێ، بە تایبەت لە پەیوەندیو هەڵسوکەوتی کۆمەڵایەتیدا، جا من ئامۆژگاریتان دەکەم کە وشكو داخراو مەبن، بەڵکو کراوەو ئیجابیی بن، بەڵام کرانەوەیەك نا هیچ شتێکی خۆتت نەمێنێو سەربکێشێ بۆ توانەوەت! چونکە مسوڵمانی وامان هەیە بە بیانووی کرانەوەو لە گەڵ خەڵك گونجان دەتوێتەوەو دەپووکێتەوەو کە سایەتیی ئیسلامیی خۆی

www.alibapir.com



لەدەست دەدات! بێگومان ئەوە زیادەڕۆیی (إفراط)ی کردوە، هەروەك بە پێچەوانەوە هەشمانە بە بیانووی پارێزگاریی کردن بە دین‌و مسوڵمانێتی خۆیەوە، زۆر داخراو و وشکەو لەگەڵ کەس ناگونجێ، یان لە گەڵ خەڵك کراوەو ڕووگەش‌و ئیجابیی نیە،کە بێگومان ئەوەش کورت هێنان‌و بە زایەدان (تفریط)ە، بەڵام هێڵی نێوەڕاست ئەوەیە کە تۆ لە گەڵ خەڵك کراوەو ئیجابیی بی، بەڵام بە ئادابی شەرعیی یەوەو لە سنوورەکانی شەرعداو بە شێوەیەك کە سوودیان پێ بگەیەنی‌و لە زیانەکانی شیان سەلامەت‌و پارێزراوبی!

لە کۆتاییدا لە خوای بەبەزەیی داواکارم ئێوەی قوتابی بە خوشك‌و براو هەموو لایەکتانەوە سەرکەوتووبن‌و سەرفرازو سەلامەت بن، خوا هاو کارو یارمەتیدەرتان بێ‌و، ڕێنموونیتان بکات کە خاوەنی کە سایەتیی یەکی مسوڵمان‌و دینداریی وابن کە بۆخۆتان بەختەوەر بن‌و کەس‌و کارو بنەماڵەشتان پێتان سەربەرز بن، وە ببنە مایەی خێرو خۆشی‌و ئاوەدانیی وڵاتتان‌و بەختەوەریی کۆمەڵگاکەشتان‌و سەربەرزیی دنیاو دوارۆژی خۆتان‌و خەڵکیشتان.

وصلّى الله على محمد وعلى آله وصحبه أجمعين والحمد لله رب العالمين

لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵتانین
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
Google Play
App Store
www.alibapir.net
کوردی - عربي - English
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر

www.alibapir.com



## پرسیاری یەکەم: مامۆستا ئایا دەبێ مامەڵەمان لەگەڵ دەسەڵاتدا چۆن بێ؟!

وەڵام: مامەڵەی خەڵك لەگەڵ دەسەڵاتی سیاسیدا پێویستە دڵسۆزانە بێ، جا چ گەنج بێ، چ قوتابی، چ هەر چین‌و توێژێك، پێویستە ئینسان دڵسۆزی دەسەڵاتی وڵات بێ، دیارە دڵسۆزی بەو واتایە نیا کە ماستاوی بۆ بکات‌و چەپڵەی بۆ لێبدات، چونکە کوردەواری خۆمان دەڵێن: دۆست ئەوەیە دەتگرییێنێ دوژمنیش ئەوەیە دەتهێنێتە پێکەنین! بۆی دڵسۆز بێ، بەو واتایەی چی بۆ ئەودەسەڵاتە قازانجەو چاکە ئەوەی بۆ بکات، بۆیە من جاری وایە خۆپیشاندان بە دڵسۆزیی دەزانم بۆ دەسەڵات، لە هەندێك لە چاوپێکەوتنەکانیشمدا گوتوومە: کاتێك خەڵك خۆپیشاندانی کرد مەڵێن: دەستێکی لە پشتەوەیە بەڵکو بڵێن: دڵسۆزەو دەیەوێ دەسەڵات ئاگادار بکاتەوەو ورییای بکاتەوە کە خەڵك بێزارو نارازییەو دەسەڵات‌و حکوومەت‌و دامەزراوەکانی کەم‌و کوڕیی‌یان هەیە، کەواتە: بەکورتی پەیوەندی ڕاست‌و دروستی خەڵك بە دەسەڵاتەوە ئەوەیە کە بۆی دڵسۆز بێ، دڵسۆزی‌یەکەشی لەوەدا بەرجەستە بکات کە هەرشتێك بۆی قازانج‌و چاکە لەوە ئاگاداری بکاتەوەو تێی بگەیەنێ بە هەر شێوازێك کە گونجاوبێ، بەڵام نابێ شتێك بکات زیانی لە قازانجی زیاتر بێ! دیارە ئەوەش بەیەك لایەنە ناکرێ، بەداخەوە من دەڵێم: تا ئێستا بەڕاستی

www.alibapir.com



دەستەڵاتی کوردی‌و ئێمەو خەڵك‌و جەماوەریش ئەوەندە پوختەو پێگەیشتوو نین بە شێوەیەك مامەڵە بکەین‌و قبوولی ڕەخنەو ڕەخنە لە خۆگرتن بکەین، کە ئیسلام دەیەوێ، نەك هەر ئیسلام بەڵکو بەشێوەیەك کە دیموکراسیش دەیخوازێ، چونکە ئیسلام لەوبارەوە زۆر لە سەرووی دیموکراسی یەوەیە! وە بۆ زانیارییتان جارێك کە (عمر بن خطاب) خوا لێی ڕازی بێ لە مزگەوتی پێغەمبەر ﷺ وتار دەدات ☐ کە نەك تەنیا سەرۆك کۆمارێك بوو بەڵکو سەرۆکی وڵاتێك بوو کە 3/1ی دنیای ئەوکاتەی لە بەر دەستدابوو- لەو وتارەدا دەڵێ: ئافرەتان لە کاتی شووکردندا مارەیی زۆر داوا نەکەن باشە بۆ ئەوەی ژن‌و ژنخوازیی بە زەحمەت نەکەوێ، ئافرەتێك دەڵێ: ئەی عومەر! ئەدی ئەوە نیە خوا لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَإِنْ أَرَدتُّمُ اسْتِبْدَالَ زَوْجٍ مَّكَانَ زَوْجٍ وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا فَلَا تَأْخُذُوا مِنْهُ شَيْئًا...﴾(النساء-20)، واتە: (ئەگەر پڕی پێستێك ☐زێڕو زیو- مارەییتان دا بە ئافرەتێکدا هیچی لێ وەرمەگرنەوە لە کاتی لێك جیابوونەوەدا)، کەواتە دروستە پڕی پێستێك مارەیی بدرێ، تۆ چۆن دیاری دەکەی؟!

جا لە ڕیوایەتێکدا هاتوە کە عومەر (خوا لێی ڕازی بێ) گوتی: (أصابت امرأة وأخطأ عمر) ئافرەتێك پێکای‌و عومەر هەڵەی کرد، لە ڕیوایەتێکی دیکەدا هاتوە کە عومەر گوتی: (کل الناس أفقه من عمر) هەموو کەس لە عومەر شارەزاترە، واتە لە مەسەلەیەکدا هەموو کەس شارەزایی یەکی هەیە کە تەنانەت خەلیفەش نەیبێ.

www.alibapir.com



مەبەستم ئەوەیە دەبێ هەڵەی دەسەڵات ڕاست بکرێتەوە!

بەداخەوە تا ئێستا دەسەڵاتی سیاسی ئێمەی کورد ئەو پوختەیی و کامڵ بوونەی نیە، بەڵام دەبێ خەڵکیش کارێك نەکات قازانجی سەری مایەی بخوات و زیانی لە قازانجی زیاتر بێ! بێگومانیش لەو ماوانەی پێشوودا هەندێك خۆپیشاندان کران، کە سەیارە سووتێنران و دەرگاو پەنجەرە شکێندران، دیارە ئەوجۆرە هەڵسوکەوتانە خەڵك دەخاتە ژێر پرسیارەوە، وە بیانووش دەداتە دەست دەسەڵات، کە بڵێ: خەڵك و جەماوەری ئێمە نازانێ خۆپیشاندان بکات و نارەزایی دەربڕێ، مادام وایە نابێ ڕێگایان پێ بدەین و سەرەنجام بیانوویان دەخاتە دەست، کە ڕێگە نەدەن یان بە شێوازێك مامەڵە لەگەڵ خۆپیشاندەراندا بکەن، کە بۆ هەردوولا خراپە وەك تەقەکردن و خەڵك ئازاردان.

**پرسیاری دووەم: ساڵانە گەشتی زانستی لە زانکۆو پەیمانگاکان ساز دەکرێ و کوڕان و کچانی قوتابی لە شارەکانی خۆ یان دوور دەکەو نەوەو زیاتریش ئەو گەشتانە مۆرکی سیاسی و حیزبایی و لایەنگرییان پێوەدیارە یاخود خۆش گوزەرانیی و خۆشی و شادیی نەك زانستی، بەڕێزتان لەم بارەیەوە ئامۆژگاریتان چییە؟**

وەڵام: ئەسڵی سەفەرکردن و گەشت و گوزار شتێکی ڕەوا (مباح)یە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿قُلْ سِيرُوا فِي الأَرْضِ فَانظُرُوا كَيْفَ بَدَأَ الْخَلْقَ...﴾(العنكبوت-20)، یان دەفەرموێ: ﴿هُوَ الَّذِي جَعَلَ لَكُمُ

www.alibapir.com


الأَرْضَ ذَلُولاً فَامْشُوا فِي مَنَاكِبِهَا وَكُلُوا مِن رِّزْقِهِ ...﴾(الملك-15)، کەواتە: سەفەرکردن‌و گەڕان بەسەر زەویدا شتێکی ڕەوایەو ئەگەر بۆ سەفرەی زانستی بێت ئەوکاتە ڕەواتریشەو چاکتریشە! بەڵام گرنگ بۆ گەنجی مسوڵمان ئەوەیە بە ڕەچاوکردن‌و پابەندییەوە بێ بە ئادابەکانی شەرعەوە، چونکە گەنجی مسوڵمان نابێ لە هیچ شتێکدا لە شێوازەی ئەدەب‌و ڕەو شتی ئیسلامیی بچێتە دەرێ، لێرەدا بەگشتی هەرئەوەندە دەڵێم.

**پرسیاری سێیەم: ماوەیە کە بەڕێزتان کەمتر لە میدیاکا دەردەکەون! زۆریش دەستخۆشی لە بەڕێزتان دەکەم بۆ بەستنی ئەم کۆڕە، بەڕێز مامۆستا حەزم دەکرد کۆڕەکە تایبەت کرابایە بە باس‌و خواس لەسەر گەنج، چونکە ئەوەندەی گەنج کێشەو گرفتی هەیە ڕەنگە قوتابی بەو شێوەیە نەیبێ، ئەگەر تیشکێکیشمان بۆ بخەیە سەر مەسەلەی هەڵس‌و کەوتی ئافرەتان‌و مەسەلەی (خۆشەویستی)یش.**

وەڵام: ئێمە پێمان باش بوو کۆڕەکەمان تایبەت بێ بە قوتابییانەوە، چونکە من بیستم کە زۆربەی ئامادەبووان قوتابین، دیارە هەموو قوتابییەکیش هەر گەنجە، بەڵام هەموو گەنجێك قوتابی نیە، دەربارەی چۆنیەتی هەڵس‌وکەوت‌و مامەڵەکردنی خوشك‌و برایانی قوتابی ئاماژە کرا بە هەندێك شت دیارە لە چەند ڕستە قسەیەکیشدا هەموو

www.alibapir.com


شتێك هەر ناگوترێ، بۆیە دەبێ گوێ بگرین. دەربارەی هەڵسوکەوتیش لەگەڵ خوشکاندا، دیارە ئەوە ئەدەبی ئیسلامیی روونی کردۆتەوە کە ئێستا لێرەدا دەرفەتی درێژە پێدانمان نییەو بەکورتی دەڵێین: لە ئیسلامدا رێگە دراوە ئافرەتان‌و پیاوان بەیەکەوە قسەو وتوێژ بکەن، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئافرەتان بەشداربوون لە کۆڕی عیبادەت‌و عیلم دا، بەڵکو لە جەنگ‌و لە چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانداو لە زۆر بواردا بەشداربوون، بەڵام ئەوەی حەرامەو قەدەغەیە ئەوەیە ئافرەتێك‌و پیاوێك بە تەنها لە شوێنێکی چۆڵ پێکەوە بن، بەڵام پێویستە بزانن کە لە قوتابخانەدا پێکەوە قسەکردنی کوڕان‌و کچان بە حەرام دانانرێ، چونکە (خَلوة) نییەو شوێنەکە چۆڵ‌و بە تەنها نیەو خەڵکی دیکەی لێیە، هەروەها کاتێك خوشکێك پرسیار لە برایەك دەکات‌و وەڵامی دەداتەوەو پێکەوە دەدوێن، یان کاتێك پیاوێك لەگەڵ زیاتر لە ئافرەتێك لە شوێنێکی بێ شوبهەدا پێکەوە دەبن، بە مەرجێك بە ئادابی شەرعییەوە بێ‌و پارێزگاریی بە رێزو ئابروو و کەرامەتی خۆیانەوە بکەن، ئەوە بە (خَلوة) دانانرێ، لە رووی شەرعییەوە بەیەکەوە بوونی حەرام (خَلوة) ئەوەیە کە پیاوێك‌و ئافرەتێك لە شوێنێك بن کە چۆڵ بێ‌و کەسی دیکەیان لەلا نەبێ، ئەگەرنا غەیری ئەوە لە هەموویدا مەجال هەیە کە خوشك‌و برایان بە یەکەوە قسە بکەن، نوێژ بکەن، لە زانیاری یەکدی سوود وەربگرن‌و لێکۆڵینەوەی زانستی ئەنجام بدەن.

دەربارەی خۆشەویستیش  کە ناچارین بە کورتی باسی بکەین  دیارە دەبێ هەموو ئیمانداران یەکتریان خۆشبوێ وەك ئیماندار، ئەوە

www.alibapir.com


شتێکی گشتییە، بەڵام ئایا پیاو تا چ ئەندازەیەك بۆی هەیە ئافرەتێکی خۆشبوێ؟

کاتێك بەتەمابێ بیکات بە هاوسەری خۆی! یان ئافرەت چ کاتێك بۆی هەیە دڵی خۆی بداتە پیاوێك؟ بێگومان ئەوە شتێکی سروشتیو ڕەوایە، بە مەرجێك مەبەست لەو خۆشەویستییە هاو سەرگیرییو پێکەوەنانی خێزان بێ، بەڵام پیاو هەر ئافرەتێکی بینی هەر خۆشی بوێ، ئەوە بە کەڵك نایەت، یان ئافرەت دڵی بەهەر پیاوێکدا بچێ، ئەوە نابێو شتێکی قەدەغەیەو، ئەو جۆرە خۆشەویستییەش ڕاست نیەو درۆیە، ئەگەرنا خۆشەویستی نێوان پیاوو ئافرەت بە ئەدەبی شەرعییەوە شتێکی ڕەوایەو پەسندیشە، وەك خوای کاربەجێ فەرموویەتی: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً ...﴾(الروم-21)، کەسی وا هەیە کە باسی خۆشەویستی نێوان کچو کوڕێك دەکرێ پێی شتێکی سەیرو عەجایبە! بەڵام ئەوەتە خوا (جل شأنه) لە ئایەتی قورئانی خۆی دا باسی کردوەو دەفەرموێ: (لە نیشانەکانی گەورەیی خوا ئەوەیە کە لە نەفسی خۆتان هاوسەری بۆ خوڵقاندوون بۆ ئەوەی لای ئەوان ئارام بگرن وە خۆشەویستیو بەزەیی خستۆتە نێوانتانەوە)، دیارە من لێرەدا باسی گەنجی مسوڵمان دەکەم، باسی کچو کوڕی مسوڵمانو پابەند بە ئیسلامەوە دەکەم، ئنجا لە ڕاستیدا و شەی خوشەویستی شتێکی (معنوي)یە، بەڵام کە لەوە دەترازێ بۆ پەیوەندیی دیکەو بۆ بەزاندنی سنوورەکانی شەرع، لە ڕاستی دا ئەو

www.alibapir.com


کاتە لە قالبی خۆشەویستی دە چێتە دەرێو دەبێتە شتێکی غەریزەیی‌و جەستەیی کە ئاژەڵیش تێیدا بەشدارە!

وە بۆ زانیاریتان مەسەلەی داوێن پیسیی، واتە: (پێکەوە جووتبوونی پیاوو ئافرەت بە شێوەی نا شەرعیی)، لە هەموو شەریعەتە ئاسمانی یەکان‌و لە هەموو یاساکانی سەر زەویدا بە شتێکی خراپ دانراوە، بەلام دیارە هەندێك لە یاساکاندا هەندێك مەرجیان خستۆتە سەر، بۆ وێنە: هەیە دەڵێ ئەگەر بە تۆبزی بێ ئەوە خراپەو، ئەگەر خیانەتی هاوسەری بێ هەر خراپەو، وە هەروەها، بەلام هیچ کەس نەبووە بە شتێکی باشی دابنێ، ئنجا لە نێو ئاژەلانیشدا وەك زانایانی ئاژەڵناس دەڵێن: جگە لە بەراز ئەگەرنا هیچ ئاژەڵێك قبووڵ ناکات ئاژەڵێکی دیکە دەستدرێژی جینسی بکاتە سەر مێینەکەی، بەلام دیارە بەراز قەلس نیە کە لە پەنا خۆی نێرەیەك سواری مێینەکەی بێت!

مەبەستم ئەوەیە شتێکی عەقلیی‌و سروشتی یەو خوای بەدیهێنەر ئینسانی بەگشتی وا خوڵقاندوە کە حەز بە پاکیی بکات‌و غیرەتی هەبێ‌و داوێن پیسیی‌و دەستدرێژیی جینسی بۆ سەر هاو سەرەکەی خۆی بە کارێکی خراپ‌و قبووڵ نەکراو بزانێ! بەلام غەیری ئەوە بریتیە لە میزاج تێکچوون‌و لادان (إنحراف)، وە لەڕاستیدا ئێستا ئەوەی پێی دەگوترێ خۆشەویستی‌و ئەویندارییی، زۆربەی هەرە زۆری حالەتێکی جەستەیی‌و غەریزەیی یەو هەربۆیەش سەر دەکێشێ بۆ کاری خراپ‌و ڕۆژانە لە ڕۆژنامەکاندا دەخوێنینەوە: ئافرەتێك دەستخەرۆ دەکرێ‌و پیاوێك بە ناوی خۆشەویستی یەوە فێڵی

www.alibapir.com



لێ‌دەکات، دوای ئەوەی دەچێ بۆلای‌و لەگەڵی ڕادەبوێرێ پوولێکی پێوە دەنێ‌و سەرگەردانی دەکات، یان ئافرەتێك پیاوێك دەبینێ‌و بۆ ماوەیەك دڵی خۆی دەداتێ‌و هەڵیدەخەڵەتێنێ‌و پاشان بەجێی دێڵێ‌و پاشگوێی دەخات‌و وە هەروەها، ئنجا ئایا ئەوە کەی خۆشەویستییە؟! ئەوە نە خۆشەویستی‌و دڵسۆزی‌یەو نە عیشق‌و ئەوینداریی! بەڵکو لە ڕاستیدا ئەوە دوژمنایەتی‌و، حەیاو ئابڕوو بردنی خەڵك‌و ئەتك کردنی خەڵکەو، وشەی خۆشەویستی زۆر لەوە بەرزترە بۆ ئەو حاڵەتانە بەکاربهێنرێ!

## پرسیاری چوارەم: باوو نەریت تا چ ئەندازە یەك بۆتە ڕێگر لەبەردەم ئینساندا کە باوەڕی بە خۆی نەبێ؟

**وەڵام:** باوو نەریت‌و عادەت‌و تەقالید بە دوو چەمك بەکاردێ: چەمکێکی فراوانی هەیە کە زۆر شت دەگرێتەوەو هەندێکی ئەدەبە شەرعییەکانن، کە بێگومان هیچ ئەدەبێکی شەرعیی‌و هیچ ڕێ‌و ڕەسم‌و یاسایەکی شەرعیی ڕێ لە هیچ بەرژەوەندی‌و قازانجێکی خەڵك ناگرێ‌و نەیگرتوە! بەڵام هەندێك لە عادەت‌و باوو نەریتی نێو کۆمەڵگا، بەڕاستی هەڵقوڵاوی نەفامیی‌و بێ‌ئاگایی کۆمەڵگایە، بەتایبەت زۆر لە شێوەکانی مامەڵەو هەڵسوکەوت لەگەڵ ئافرەتدا، جا دیارە ئەو جۆرە عادەت‌و تەقالیدە شتێکی نەفامیی یەو هیچ پەیوەندی بە شەرعەوە نیە، بۆیە ئێمە پشتگیریی ئەوە دەکەین کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا ستەم لە ئافرەت کراوەو، نا شەرعیی لەگەڵ کراوەو

www.alibapir.com


لە زۆرینەی مافەکانی بێبەش کراوە، بەڵام نەك لەبەر ئەوەی ئیسلام وا دەڵێ، بەڵکو لەبەر ئەوەی بە ناشەرعیی مامەڵەی لەگەڵ کراوە!

ئەگەر نا ئێمە دەزانین کە لە کۆمەڵگای ئێمەدا بێئاگایی‌و نەزانیی خەڵکیش لە شەرعی خوا زەمینەی خۆشکردوە کە خەڵك بەرەو بێدینی بچێ‌و کەسانێك پێیان وابێ ئیسلام زوڵمی لە ئافرەت کردوە، وەك چۆن خەڵکێکی نەزان پێیان وابوو ئیسلام ڕێگای داوە ڕژێمی بەعسی عەلمانی زوڵم لە میللەتی کورد بکات، نازانن کە عەلمانییەت وای لێکرد ئەو زوڵم‌و ستەمە بکات، ئەگەر ڕژێمی بەعس یان ڕژێمی ئەتاتورك پابەندی ئیسلام بوونایە، ئیسلام ڕێگەی لێدەگرتن‌و نەیدەهێشت ئەو زوڵمە لە گەلی کوردی مسوڵمان بکەن! کەواتە پێویستە ئێمە سەرچاوەی شتەکان بزانین لێمان تێك نەچن، بێگومان ئێمە لە ناشەرعیی‌یەوە تووشی زیانەکان بووین‌و تەنیا بەهۆی شەرعیشەوە ئەو زیانانەمان لەسەر لادەچن، عادەت‌و باوی نێو کۆمەڵگاش جگە لەو بەشەی کە ناشەرعییەو هەڵقولاوی نەفامییە، ئەوەی دیکە پێویستە پارێزگاریی لێ بکرێ، چونکە ڕێ لە شتی چاك‌و بەرژەوەندی خەڵك ناگرێ‌و نابێتە کۆسپ لە بەردەم بەرەو پێش چوونی کۆمەڵگادا.

www.alibapir.com


**پر سیاری پێنـ جەم: مامۆ ستای بەرێزمـــ ـان ئـ یوە وەك کە سایەتی یەکی د یاری تەوژمی ئیسلامیی کورد ستان چیتان کردوە بۆ کێشەی خوشکە (دوعا) کە تەنیا لە بەر م سولمانبوونی یەز یدی یەکان بە دڕندا نەترین شێوە کوشتیان؟!**

**وەلام:** بەلێ بەرا ستی ئەو کارە ساتە زۆر دلْ هەژێن‌و تراژ یدیی‌و دلْ نارەحەتکەر بوو، کە دیارە زۆربەتان بینیوتانە، من لەوبارەوە لە کەنالی ئاسمانی کوردستان (K.TV) لە چاوپێکەوتنێکی کورتدا چەند قسەیەکم کردن‌و گوتم ئەو کارە هەتا بلێی شتێکی دڕندانەو دلڕەقانەو خراپ بوو و هەموو ئەوانەی دەستیان تێدا بووە شاي ستەی سزای سەخت‌و دادگەرانەن.

بەلام وەك چۆن کوژرانی ئەو خوشکە بەو شێوەیە زۆر شتێکی خراپ‌و قێزەونەو بەهەر وشەیەك وەسفی خراپەی بکەی تەواو نابێ، بە هەمان شێوەش کوشتنی خەلکی بێ‌خەتای یەزیدیی، کرێکارێك، مامۆستایەك، قوتابییەك، پزیشکێك، جوتیارێك....هتد، ئەوەش بەرا ستی هەر تاوان (جریمة)ەو لە شەریعەتی ئیسلامییدا جێی نابێتەوە!

بەلێ نابێ ئێمە بە هۆی تاوانی کۆمەلە خەلکێك‌و رق هە ستانمان لێیان تەرو وشك پێکەوە بسووتێنن! بەلام بێگومان ئێ مە بەتو ندی نارەزایی خۆمان بەرامبەر بەو تاوانە زلە دەربڕ یوەو ئیدا نەی ئەو

www.alibapir.com



کارەمان کردوە، وەك لە (K.TV)شدا ڕامگەیاند کە پێویستە ئەو کەسانەی دەستیان لەو کارە دڕندانەیەدا هەبووە دادگایی بکرێن‌و سزای سەختی خۆیان وەربگرن.

بە پێی زانیاری ئێمەش خەڵکێکی ئیسلامیی لەو ناو چانەی لای خۆیان پێش ئەوەی دەست بۆ یەزیدییەکان درێژ بکەن، ناوی (30) کەسیان داوەتە یەزیدی‌یەکان‌و داوایان کردوە ئەو ناوانەیان تەسلیم بکرێن ئەگەر بیانەوێ بەربەلا نەبن دیارە ئەو ناوانە ڕەسمیان گیراوەو دەستیان هەبووە لە بڵۆك پێدا کێشان‌و پێلاقە پێدادانی ئەو ئافرەتەدا- دوایی کە یەزیدیی‌یەکان وەلامیان نەبووە، ئنجا ئەوان دەستیان بەکوشتنیان کردوە، هەڵبەتە من ئەو کوشتنە ڕەشەکوژییەش بە ڕاست نازانم، بەلام بێگومان بەشێکی بەرپرسیارێتی دەکەوێتە ئەستۆی یەزیدیی‌یەکان کە پێویست بوو نەهێڵن شتی وا ڕووبدات، یان کە ڕووشیدا دەبوو تاوانباران تەسلیم بکەن!

**پرسیاری شەشەم: کاتێك قوتابیان زوڵمیان لێ دەکرێ‌و بە (واسطة) نەبێ لە زانکۆ یان خوێندنی بالا وەرناگیرێن چی بکەن باشە؟ دیارە بۆ دامەزراندنیش هەر دەبێ پەنا بەرنە بەر (واسطة).**

وەلام: کاتێك زوڵم لە قوتابیان دەکرێ‌و مامەڵەی حیزبیی‌و سیاسییان لەگەڵ دەکرێ، چۆن بکەن؟

من لە سەرەتاوە گوتم: ئەو قەیران‌و کێشانەی کە هەمانن بە تەنیا

www.alibapir.com



هی قوتابیان نین بەڵکو هی هەموومانن، کەواتە تەنیا بە قوتابیانیش چارەسەر ناکرێن، جا ئەوە بوو من کۆمەڵێك ئامۆژگاری‌و پێ شنیارم خستنە ڕوو کە بەو شێوە قوتابیان دەتوانن فاکتەرێکی ئیجابیی بن لە دروستکردنی گۆڕانکاریی لە کۆمەڵگاکەماندا، کە مایەی خۆڕاگریی‌و نائومید نەبوون‌و ڕانەکردنن لەم واقیعەی تێی کەوتووین، بەڵام وێڕای ئەوەش بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو حاڵەتە تای بەتی‌و شەخ سییانەش دەبێ هەڵوێست هەبێ‌و پێویستە قوتابیان قسە بکەن، شت بنوو سن، ڕەخنە بگرن‌و نارەزایی دەربڕن، با لە پۆلدا لە گەڵ مامۆ ستا قـ سە بکەن لەوبارەوە، با لە کات‌و شوێنی خۆیدا خۆپیشاندان بکەن‌و، کۆڕ‌و سیمینارەکان‌و ئەو شتانەی کراون کاریگەری یان هەبووە‌و وای کردوە زۆر کەس بە خۆیدا بچێتەوە، هەروەك چۆن کاتی خۆی سی ستەمی سەرمایەداریی لەژێر فشاری سۆسیالیزم‌و بلۆکی ڕۆژ هەلات (یەکێتی سۆڤیەت)دا -کە رەواج پێدەری فیکرەی شیوعیەت‌و مارک سیەت‌و سۆشیالیستی بوو- بە خۆیدا چۆوە‌و چاوی بە زۆر شتی خۆ یدا گێڕایەوە‌و ژیانی کرێکارانی زۆر چاك کردو وەز عی خەڵکی گۆڕی بەرەو خۆشگوزەرانی باشتر.

مەبەستم ئەوەیە ئەو خەبات‌و چالاکی یانە ئەو هەڵوێست نواندنانە بێ کاریگەریی نابن، بەڵام بێگومان تەنیا بە قوتابیانیش ناکرێ، ئەوە پێویست دەکات لە پەرلەماندا لایە نە سیا سیی یەکان هەڵوێ ست وەربگرن‌و لە هەموو ئاستەکاندا کاری زۆری لەسەر بکرێ، هەروەها نووسەران شت بنووسن‌و هەموو چین‌و توێژەکانی کۆمەڵگا قسە لەسەر ئەو حاڵەت‌و دیاردانە بکەن‌و، خۆپیشاندان ساز بـ کەن بە شێوەی

www.alibapir.com


ئیجابیی کە ببێتە هۆی گۆڕانکاریی‌و چاکسازیی، ئەوەش مافێکی ڕەوای خەڵکە چ قوتابی بن چ هەر توێژێکی دیکە.

**پرسیاری حەوتەم: دەربارەی گرتنی وێنەی (تخرّج) لە زاذکۆو پەیمانگاکان، کاتێك کوڕان‌و کچانی دەرچووی زاذکۆو پەیمانگاکان بە بۆنەی دەرچوونیانەوە بە یەکەوە وێنەی یادگاری دەگرن، ئایا لە ڕووی حەڵاڵیی‌و حەڕامیی یەوە حوکمەکەی چی‌یەو چۆنە؟**

**وەڵام:** من وێنەگرتن لە ئەسڵدا بە ڕەوا (مباح) دەزانم، ئەگەرچی هەندێك لە زانایان بە حەرامی دەزانن، بەڵام زۆربەی زانا یانی هاو چەرخ بە ڕەوای دەزانن، هەم وێنەی ڤدیویی‌و هەم هی فۆتۆگرافیش، ئەوە بە گشتی، بەڵام لەبارەی ئەوەی کە باسکرا کۆمەڵێك خوشك‌و برا یان کۆمەڵێك قوتابی کچ‌و کوڕ بە یەکەوە وێنەی دەستە جەمعی ب گرن، بەڕاستی من بۆ خوشکان پێم باش نیە وێنەیان بڵاوبێ تەوە! چونکە خۆتان دەزانن جۆرەها فرت‌و فێڵ‌و ساختەکاریی هەیە، حا شای ئەو خوشك‌و برایانە، خەڵکی خراپ هە یە کە ڕەن گە دوا یی وێ نەی خوشکێك بەکاربێنێ‌و (إستغلال)ی بکات بۆ مەبەستێکی خراپ، بۆ شکاندنی کەسایەتیی‌و ڕووشاندنی سومعەی! بۆیە پێم باشە بە پ ێی توانا ئافرەتان وێنەیان بڵاونەبێتەوە، بەڵام ئەگەر دەستە خوشکێك لە یەکدی ئەمین بن کە وێنەکە بۆ مەبەستی خراپ بەکار ناهێنرێ، وە بەرگ‌و پۆشاکی شەرعیی‌یان لەبەردابێ، هیچ نا شەرعیی‌یەکی ت ێدا نابینم، بەڵام دیارە وێنەی ئافرەتێکی مسوڵمان لای کوڕێکی گەنج بێ حەڵاڵ نیەو شتێکی خراپە، خۆشتان دەزانن‌و ئاگادارن لە مە سەلەی

www.alibapir.com


مۆبایل‌و وێنەوە هەندێك شت پەیدا بووەو دەگونجێ پەیدا ببێ کە دوایی خراپەی لێ‌دەکەوێتەوە بۆ خێزانەکان‌و بۆ کۆمەڵگاش!

**پرسیاری هەشتەم: ئیسلام تەنیا عەقیدە نیەو شەریعەتیشەو دەچێتە نێو سەرجەم لایەنەکانی ژیانەوە، جا ئایا ئەوە لەگەڵ گۆڕان (تطور)دا دژ ناوەستێ؟!**

**وە ئایا (طالیبان) خاوەنی فیکرێکی دۆگماو وشك نەبوون؟!**

**وەلام:** ... بەڵێ ئیسلام هەر عەقیدە نیە بەڵکو شەریعەتیشەو چۆتە نێو هەموو وردو درشتی ژیانەوەو چۆتەنێو هەموو وردە کاریی یەکانی ژیان، ئەوەی کە پێویست دەکات، بەلام جاری وایە تەنها هێڵی گشتی (خطوط عریضة)ی داناون بەتایبەت لە ڕووی سیاسی‌و ئابووریی یەوە، وە شەریعەت بە شێوەی ئیجابیی چۆتە نێو وردو درشتی ژیانەوە، بە شێوەیەکی وا کە ئینسان لە لایەکەوە دەستی کراوە بێت‌و ڕێی گۆڕانکاریی لێ نەگیرێ‌و، لە لایەکی دیکەشەوە تووشی هەڵدێران‌و لادان (إنحراف) نەبێ، لەبارەی بۆچوونیشمەوە لەبارەی بزووتنەوەی (طالیبان)ەوە دەڵێم: ئێمە کاتی خۆیشی تێبینیمان هەبوو لە سەر جۆری بیرکردنەوەیان، کە بەڕاستی جۆری تێگەیشتنیان بۆ ئیسلام تێگەیشتنێکی کۆن بوو نەك تێگەیشتنێکی سەردەمانە، واتە تێگەیشتنێکی قورئانیی نەبوو، چونکە قورئان بۆخۆی پێمان دەڵێ کە دەبێ بە پێی سەردەمی خۆمان لێی تێبگەین، لێرەدا مەبەستمان ئەوە نیە بە ئارەزووی خۆت تەفسیری دەقەکانی قورئان‌و سوننەت

www.alibapir.com


بکەی! بەڵام ئەگەر بمانەوێ کیان‌و قەوارەیەکی ئیسلامیی لەم سەدەی (21)ەمەدا بەڕێوەبەرین، بەڕاستی بەو میکانیزمەی سەردەمی پێغەمبەر ﷺ پێی بەڕێوەبراوە، بەڕێوەنابردرێ، بەڵکو بە میکانیزمی سەردەم بەڕێوە دەبردرێ! بۆیە زانایانی ئیسلام بنچینەیەکی شەرعییان داناوەو دەڵێن: ئامانج‌و مەقاصیدی شەرعیی نەگۆڕن، بەڵام ئامرازو شێوازەکانیان گۆڕاون‌و ئامرازو شێوازەکان دەبێ بگۆڕێن بە پێی گۆڕانی سەردەم، بەڵام ئامانجە شەرعییەکان هەر لە شوێنی خۆیانن، بەڵام پێویستە هەموولایەکیش بزانین کە ئەوەندەی خەڵکی ئیسلامیی بە گشتی کراوەیە بە ڕووی فیکرو فەرهەنگ‌و کلتووری غەیری خۆیدا، خەڵکی عەلمانیی ئەوەندە کراوە نیە! وە من خەڵکی عەلمانیی زیاتر بە دۆگما دەبینم، چونکە هەر شتی خۆیان دەزانن، بەڵام خەڵکی ئیسلامیی بەگشتی شتی خەڵکی دیکەش دەخوێنێتەوەو هەوڵی فێربوونی دەدات، وە کراوەیەو بە ئینسافیشە، وە ئێستا لێرەدا وەك زۆر چاو پێ کەوتن‌و دیمانەی دیکەم، من ڕایدەگەیەنم کە لە نێو خەڵکی عەلمانییدا کەسانی بە ئینساف هەن، خەڵکی کراوەیان تێدایە کە لە عەقڵەوە دەڕواننە شتەکان، بەڵام هەشیانە لە ڕق‌و کینەو بوغزەوە دەڕوانن، ئێمە زۆر جاران دان بەچاکەی ئەواندا دێنین کە هەیانبێت، بەڵام عەلمانییەکان کەمتر وایە دان بە چاکەی ئێمەدا بێنن، یان ئەگەر عەلمانییەك هەڵەیەك بکات، دەڵێین: ئەو بابایە هەڵەی کرد، ناڵێین: هەرچی عەلمانیی دنیا هەیە هەڵەیان کردوە! بەڵام ئەوان بەردێك لە ئاسمان بەربێتەوە، یان لەوسەری دنیا ئیسلامییەك هەڵەیەك بکات، دەڵێن: هەموو

www.alibapir.com


ئیسلامییەکان نەگونجاون و خراپن! بەڕاستی ئەوە زۆر بێ ویژدانییە، ئەگەرنا قسەی ئەو برایە جوان بوو، بێگومان دەبێ موسوڵمانان فرە زانست بن و فراوانتر بیر بکەنەوە، بۆیە لە پێناسەی ئینسانی رۆشنبیر (مثقف)دا گوتراوە: رۆشنبیر کەسێکە لە هەموو شتان شتێك بزانێ و لە شتێکیشدا زۆر بزانێ!

**پرسیاری نۆیەم: نووسەرێك لە کتێبێکیدا نووسیویەتی: پێغەمبەران زۆر زیانبەخش بوون بۆ مرۆڤایەتی! جەنابت لەوبارەیەوە چی دەڵێی؟!**

وەڵام: لەبارەی ئەو کەسەوە کە گوتوویەتی: پێغەمبەران سەریان لە خەڵك شێواندوە!، دیارە کەسانێك قەناعەتیان وایە کە پێڕی شەیتان بن، چونکە پێڕو تاقمی شەیتان دوژمنی پێغەمبەرانن -عَلَيْهِم الصَّلاة والسَّلام-و پێغەمبەران هاتوون خەڵکیان فێری خواناسیی و خواپەرستیی کردوەو لە بت پەرستیی و ئینسان پەرستیی و طاغوت پەرستیی دووریان خستوونەوە، هەیە بەختەوەریی لەوەدا دەبینێ کە هەواو ئارەزووی خۆی بپەرستێ و دارو بەرد بپەرستێ و نەمروودو فیرعەون و کەسانێکی وێنەی خۆی بپەرستێ، بەڵام پێغەمبەران بۆیە نێردراون خەڵکیان بەرەو خوا پەرستیی بانگ کردوەو لە هەموو ئەو شتانە دووریان خستوونەتەوەو پێیان گوتوون: بەس خوا بپەرستن، چونکە ئەوەی دەپەرسترێ لە غەیری خوا یان وەك خۆتە کە ئینسانەکانن، یان لە خوار خۆتەوەیە، کە سەرجەم شتەکانی دیکەن.

www.alibapir.com


جا دیارە کەسێك وا سەیری پێغەمبەران (عَلَيْهِم الصَّلاة والسَّلام) بکات، کەسێکی نا مسوڵمانەو هەر ئەوەشی لێ چاوەڕوان دە کرێ، بەڵام نامسوڵمانێکی بێویژدانیشە، چونکە ئەوەتا زانایەکی ئەورووپی بەناوی (مایکل هارث) کتێبێکی هەیە کە بە عەرەبی وەرگێڕدراوە بەناوی: سەد کەسە یەکەمەکان (المائة الأوائل)، بە کوردیش هەر وەرگێڕدراوە، ئەو کابرایە باسی (100) کەسی کردوە کە بە درێژایی مێژووی بەشەر زیاترین کاریگەریی ئیجابیی‌و باشیان هەبووە، جا لەنێو ئەو کەسانەدا پێغەمبەری کۆتایی (محمد ﷺ)ی بە یەکەم کەس داناوە  هەرچەندە نوو سەر خۆی نەصرانیی شە- وە دە ڵێ: (محمد) لە هەموو ئینسانەکانی سەرزەوی کاریگەریی زیاتر بووە لە ژیانی بەشەردا، هەروەها هەموو مێژوونووسە بەویژدانەکانی ڕۆژئاوا گوتوویانە: شارستانێتی ڕۆژئاوا قەرزداری شارستانێتی ئیسلامیی‌یە، چونکە ڕاپەڕینی زانستی ڕۆژئاوا (ڕێنسانس) دوای ئەوە سەری هەڵدا کە کتێبەکانی زانایانی مسوڵمان وەرگێڕدرانە سەر زمانە ڕۆژئاواییی‌یەکان‌و لە بەرهەمی زانستی مسوڵمانان سوودیان وەرگرت، بەڵێ خەڵکی بە ئینسافی واهەیە ئاوا دەڵێ‌و بێ ئینساف‌و بێویژدانی واشمان هەیە دەڵێ: پێغەمبەران-عَلَيْهِم الصَّلاة والسَّلام- زیانبەخش بوون بۆ مرۆڤایەتی!!

www.alibapir.com


**پرسیاری دەیەم: ئەو خوشکانەی بڕیاری پابەندبوون بە ئیسلامەوە دەدەنو دەبنە بالاپۆش، ئەگەر لە مالەوە لەلایەن کەسو کاریانەوە فشاریان لەسەربێ دەکرێ هەروەك خۆیان بمێننەوە؟**

وەلام: بێگومان بۆ بالاپۆش بوون دەبێ لەپێشدا گۆڕانکاریی لە عەقلو دلدا ڕوو بدات، ئەوکاتە بالاپۆشیی جێی خۆیەتی، واتە: دوای ئەوەی ئەو ئافرەتە ئەو ئیمانو بیروباوەڕەی بۆ دروست دەبێ کە خوا بەو شێوەیە لێی ڕازی دەبێ کە وەك چۆن خاوەنو هەلگری عەقیدەی ئیسلامیی یەو عیبادەتی ئیسلامیی ئەنجام دەدات، دەبێ بەرگو پۆشاکی ئیسلامییش لەبەر بکاتو خۆی بالاپۆش بکات، جا لە حالەتێکی ئاوادا کە ئەو ئافرەتە مسولمانە بەهۆی پۆشینی بەرگو پۆشاکی ئیسلامیی یەوە لە لایەن کەسوکارییەوە گرفتو کێشەی بۆ دروست بێ زیاد لەوەی کە خۆی تەحەمولی دەکات دیارە پۆشاکیی شەرعیی هەر لەسەر فەرزە- بەلام ئەو کاتە وەبەر ئەو بنچینە شەرعیی یە دەکەوێ کە دەلێ: (الضرورات تُبيح المحظورات) واتە: لە کاتی ناچارییدا حەرام حەلال دەبێو لە حالێکی وادا ئەو خوشکە گوناهبار نابێ بە مەرجێك هەموو توانای خۆی بەکاربێنێو کەمتەرخەمیی نەکات، چونکە خوا (عزّ وجلّ) لە توانابەدەر لە کەس داوا ناکات: ﴿لاَ يُكَلِّفُ اللّهُ نَفْسًا إِلاَّ وُسْعَهَا...﴾(البقرة-286)،

www.alibapir.com


ئەگەرنا لەسەری فەرزە خۆی دابپۆشێ‌و بەرگی شەرعیی لەبەر بکات، وەك چۆن عەقیدەو عیبادەت‌و ئەرکەکانی دیکەی لە سەر پێویستن، بەڵام خوشکێك هەر هێندەی لە تواناداهەبێ کە نوێژەکانی بکات‌و هەندێك عیبادەت‌و ڕەوشتی ئیسلامیی ئەنجام بدات‌و ڕێگەی نەدرێ وەك شەرع فەرموویەتی خۆی بالاپۆش بکات، ئەوکاتە گوناهبار نابێ، چونکە بەپێی توانا پارێزکاریی کردوەو خواش فەرموویەتی: ﴿ فَاتَّقُوا اللَّهَ مَا اسْتَطَعْتُمْ... ﴾ (التغابن-16)، واتە: ئەوەندەی لە تواناتاندا هەیە پارێز لە خوا بکەن‌و خۆتان لە ناشەرعیی یەکان بپارێزن.

**پرسیاری یازدەیەم: دەستخۆشی بۆ مامۆستای بەڕێز، ئەوەی مامۆستا باسی کرد وەك وتارێکی ئایینی وابوو، دەبوو باسی کێشە ئابووری یەکان کرابا یەو هۆکارو چارەسەری بۆ دیاری کرابایە!**

**وەڵام:** سوپاسی ئەو برا بەڕێزەش دەکەین، ئەوەش کە باسی کرد کۆڕەکەمان یان وتارەکەم لە وتاری ئایینی‌و وتاری سەر مینبەری مزگەوت‌و ڕۆژی هەینی دەچوو، بێگومان ئەوە هیچ عەیبی تێدا نیە، ئێستا وتاری هەینی زۆر لە مامۆستایان یەکێکە لەو مینبەرە کەمە ئازادانەی کە ڕاستییان لە سەر بگوترێ‌و دەستەڵاتی سیاسی نەیتوانیبێ قۆرخیان بکات!

ئەوەش نەك هەرمن بیڵێم بەڵکو نووسەرێکی عەلمانیی وەك ( کاك

www.alibapir.com


ڕێبین هەردی)یش دەڵێ[1]: لەجیاتی مینبەری ئازاد زۆر بکەن ئەو مینبەرە ئازادانەش کە هەن دایان مەخەن، هەندێك مامۆستا قسەی حەق دەکەن مینبەری ئازادی دیکەش زیاد بکەن، نەك ئەوانەش کە چوار قسەی حەقیان لەسەر دەکرێ دایانبخەن! ئەوە کەسێکی خاوەن ئینساف‌و بە ویژدان ئەو قسەیەی کردوە، کەواتە: وتاری ئێمە ئەگەر لەشێوەی وتاری هەینیش دابێ، هیچ عەیبێکی تێدا نییەو بەڵکو شتێکی زۆر چاکیشەو مرۆڤی مسوڵمانیش هەردەبێ لەبەر ڕۆشنایی قورئان‌و سوننەت دا بدوێ!

سەبارەت بە لایەنی ئابووررییش، باسمکرد کە یەکێك لەو قەیرانانەی تێیانداین مەسەلەی چینایەتی‌و قڕیی‌و پڕیی یە لە سۆنگەی ئەوەوە کە دەستەلات زۆربەی ئیمتییازەکانی بۆخۆی قۆخ کردوە.

ئنجا خوشك‌و برا خۆشەویستەکانم!

من لەم کۆڕەمدا مەبەستم ئەوە نەبوو کە نەخشەی بنیاتنانی کیان‌و قەوارەیەکی ئیسلامیی دابنێم! بەڵکو ئامانجی من لەم کۆڕەمدا ئەوەبوو کە لە ڕووی ئیمانیی‌و فیکریی‌و ڕووحیی‌و کلتووریی‌و خووڕەو شتەوە هەندێك ئامۆژگاریتان بکەم، کە ئێوە بتوانن بەرەنگاری ئەم هەل‌و مەرج‌و وەزعە ناهەموارەی کوردستان ببنەوەو بەرهەڵستیی بکەن‌و هەوڵی پاکسازیی‌و چاکسازیی بدەن، نەك تەسلیم بن‌و تێیدا بتوێنەوە، یان لەبەری ڕابکەن‌و بەرەو هەندەران سەری خۆتان هەڵگرن!!

(1) لە هەفتەنامەی (هاووڵاتی)دا ئەم قسەیەی کردبوو.

www.alibapir.com


ئاشکراشە کە نەخشەو پلان دانان بۆ چارەسەری کێشەو گرفتە سیاسیو ئابوورییو کۆمەڵایەتییەکان، پێویستە لە ئاستی پەرلەمانو حکوومەتو دامو دەزگاکانیاندا بەڕێوەبچێ، بەڵگە نەویستیشە کە لە کۆڕێکی ئاوادا دەرفەتی باسکردنی هەموو شتێك نابێ.

# نێوەرۆك

www.alibapir.com



| | |
|---|---|
| دەستخۆشی لە بەڕێزتان دەکەم بۆ بەستنی ئەم کۆڕە، بەڕێز مامۆ ستا حەزم دەکرد کۆڕەکە تایبەت کرابایە بە باس و خواس لە سەر گەنج، چونکە ئەوەندەی گەنج کێشەو گرفتی هەیە ڕەنگە قوتابی بەو شێوەیە نەیبێ، ئەگەر تیشکێکیشمان بۆ بخەیە سەر مەسەلەی هەڵس وکەوتی ئافرەتان و مەسەلەی (خۆشەویستی)یش. | |
| پرسیاری چوارەم: باوو نەرێت تا چ ئەندازەیەك بۆتە ڕێگر لەبەردەم ئینساندا کە باوەڕی بە خۆی نەبێ؟ | 54 |
| پرسیاری پێنجەم: مامۆستای بەڕێزمان ئێوە وەك کەسایەتی یەکی د یاری تەوژمی ئیسلامیی کوردستان چیتان کردوە بۆ کێ شەی خو شکە (دوعا) کە تەنیا لە بەر م سوڵمانبوونی یەز یدی یەکان بە دڕندانەترین شێوە کوشتیان؟! | 56 |
| پرسیاری شەشەم: کاتێك قوتابیان زوڵمیان لێ دەکرێ و بە (واسطة) نەبێ لە زانکۆ یان خوێندنی بالاّ وەرناگیرێن چی بکەن با شە؟ د یارە بۆ دامەزراندنیش هەر دەبێ پەنا بەرنە بەر (واسطة). | 57 |
| پرسیاری حەوتەم: دەربارەی گرتنی وێنەی (تخرّج) لە زانکۆو پەیمانگاکان، کاتێك کوڕان و کچانی دەر چووی زان کۆو پەیمانگاکان بە بۆ نەی دەرچوونیانەوە بە یەکەوە وێ نەی یاد گاری دە گرن، ئا یا لە ڕووی حەلاڵیی و حەرامیی یەوە حوکمەکەی چی یەو چۆنە؟ | 59 |
| پرسیاری هەشتەم: ئیسلام تەنیا عەقیدە نیەو شەریعەتیشەو دە چێتە ن ێو سەرجەم لایەنەکانی ژیانەوە، جا ئایا ئەوە لەگەڵ گۆڕان (تطور)دا دژ ناوەستێ؟! وە ئایا (طالیبان) خاوەنی فیکرێکی دۆگماو و وشـك نەبوون؟! | 60 |
| پرسیاری نۆیەم: نووسەرێك لە کتێبێکیدا نووسیویەتی: پێغەمـ بەران زۆر زیانبەخـش بوونە بۆ مرۆڤایەتی! جەنابت لەوبارەیەوە چی دەڵێی؟! | 62 |
| پرسیاری دەیەم: ئەو خوشکانەی بڕیاری پابەندبوون بە ئیـ سلامەوە دەدەن و دەبنە بالاپۆش، ئەگەر لە ماڵەوە لەلایەن کەس و کاریانەوە ف شاریان | 64 |

www.alibapir.com






لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لەگەڵمانبن
Stay in touch on social media
نحن معكم عبر مواقع التواصل الاجتماعي
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir/عەلی باپیر
archive.org/details/@alibapir
AliBapir/عەلی باپیر
کەناڵی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر
AliBapir
www.alibapir.net
English - عربي - کوردی
ڕاگەیاندنی مەکتەبی مامۆستا عەلی باپیر